

# خۆرى ئیسلام



گۆڤارێکی رۆشنبیری زانستی ئیسلامی
وەرزییە وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی
هەرێمی کوردستانی عێراق دەری دەکات

# 15

## ساڵی چوارەم

ذي الحجة ١٤٢٢ كۆچی رەشەمێ ٢٧٠١ ی کوردی

شوباتی ٢٠٠٢ی زایینی

خاوەنی ئیمتیاز
**عەدنان نەقشبەندی**

سەرنووسەر
**خورشید شێرە**

دەستەی نووسەران
**مەلا عبداللطیف بامۆکی**
**قاسم رەسوڵ بەرزنجی**
**سەلام کەریم سیدان**
**مەریوان مەحمود کاکە شێخ**

**ناونیشان**

هەولێر دیوانی وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی
بەڕێوەبەرایەتی راگەیاندن
☎ ٢٢٣٠٩٤٤
٢٢٢٢٦٩٣

پیت چنین: کۆمپیوتەری وەزارەت نەخشەسازی: کۆمپیوتەری دەریا
فەرزی بەرگ: چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین/ هەولێر

# ناوەڕۆك






وَلاَ تَقُولَنَّ لشَيْءٍ إنِّي فَاعلٌ ذَلكَ غَدًا* إلاَّ أَنْ يَشَاءَ اللَّهُ وَاذْكُرْ رَبَّكَ إذَا نَسيتَ وَقُلْ عَسَى أَنْ يَهْديَني رَبِّي لأَقْرَبَ منْ هَذَا رَشَدًا

صدق الله العظيم

( سورة الكهف/ ٢٣ - ٢٤ )

هەرگیز مەڵێ من لە داهاتوو ئەم کارە ئەنجام دەدەم تەنها ئەگەر حەزو ئیرادەی خوای لەگەڵدا بێ، وە بیر لە یەزدانی میهرەبان بکەرەوە هەر کاتێ لەیادت چو و بڵێ خوایە هیدایەتم بدەیت بۆ ڕێگایەکی چاکتر





**عن ابن عباس** رضي اللهُ عنهُ: أَنَّ امْرَأَةً مِنْ جُهَيْنَةَ جَاءَتْ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَتْ: إِنَّ أُمِّي نَذَرَتْ أَنْ تَحُجَّ، فَلَمْ تَحُجَّ حَتَّى مَاتَتْ، أَفَأَحُجُّ عَنْهَا؟ قَالَ: «نَعَمْ، حُجِّي عَنْهَا، أَرَأَيْتِ لَوْ كَانَ عَلَى أُمِّكِ دَيْنٌ، أَكُنْتِ قَاضِيَتَهُ؟ اقْضُوا اللَّهَ، فَاللَّهُ أَحَقُّ بِالْوَفَاءِ». رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ.

**سبل السلام ج٢/ ص٢٩٢**

**كوری عەباس(ر.خ) دەڵێت ئافرەتێك لە(جوهەینە) هاتە خزمەت پێغەمبەر(د.خ) گوتی دایکی من لەسەرخۆی (نەزر) کردبوو حەج بکات بەڵام حەجی نەکرد تاکو مرد. ئایا حەجی بۆ بکەم، فەرمووی بەڵێ حەجی بۆ بکە، ئایا تۆ نابینی ئەگەر قەرز لەسەر دایکت هەبێ ئەبێ بۆی بدەیتەوە کەواتە قەرزی خوا بدەوە چونکە خوا لەهەموو کەس زیاتر هەقی هەیە.**

عَنِ ابْنِ الزُّبَيْرِ رَضِيَ اللَّهُ عنهما قَالَ: «قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «صَلاَةٌ فِي مَسْجِدِي هٰذَا أَفْضَلُ مِنْ أَلْفِ صَلاَةٍ فِيمَا سِوَاهُ إِلاَّ الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ، وَصَلاَةٌ فِي الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ أَفْضَلُ مِنْ صَلاَةٍ فِي مَسْجِدِي هٰذَا بِمِائَةِ صَلاَةٍ». رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَصَحَّحَهُ ابْنُ حِبَّانَ.

**سبل السلام ج٢/ ص٢٩٢**

**لەکوری زبیرەوە(ر.خ) دەڵێت پێغەمبەر(د.خ) فەرموویەتی (نوێژ لەمزگەوتی من باشترە لەهەزار نوێژی مزگەوتەکانی تر بەس مزگەوتی (حرام) نەبێت وە نوێژ لەمزگەوتی (حرام) باشترە لەمزگەوتی من لە سەد نوێژ.**





﴿ إنّا نحنُ نزّلنا الذّكرَ
وإنّا لهُ لحافظون/ سورة الحجر-٩ ﴾

ئێمه خۆمان ئەم قورئانەمان ناردۆته خوار
هەر ئێمەشین دەیپارێزین

# پەیامی خۆری ئیسلام

سەرنووسەر

زۆر لە مێژە بەلایەکی یەکجار گەورەو ئالۆز رووبەرووی زمان و ئەدەب و فەرهەنگی کوردیمان بۆتەوە، کەخۆ بەکەمزانین و لەخۆ نائومێدیمانە لەبواری گوتاری رۆشنبیری ئایینیو پەروەردەیی گیانیو دەروونیو ئامۆژگاری بە زمان و نووسینی خۆمان و هەندێ جار دەستی راکێشاوە بۆ شێوازی نزاو پاڕانەوە لە پەروەردگارو شیکردنەوەی بنەماکانی قورئان و ئیسلام و باوەڕ، کارگەیشتە ئەوە وتاری هەینی بەزمانی کوردی جێگەی وتاری نوێژی هەینی نەگرێتەوە.

ئێستاش وا لەبەر چاوە، رۆژی رووناك و خۆری کورد لە مۆمێکی پرشنگدارو گەرمی بەخشدا لەسەر بەژن و بالای کوردستان ئاوێزان بووە، پاشەڕۆژمان رۆشن و گەشەدارە بەبوژانەوەی زمان و وێژەو فەرهەنگی کوردیمان لەچوارچێوەی ئیسلام پەروەریو ئایینداری هاوشانی گەلانی هاودین و هاوژین لەداوی ناحەزو نەیاران رزگاربووین و زانایان و وتاربێژان لەسەرانسەری مزگەوت و دوانگەو میحرابەوە ئەرکی خۆیان بەشێوەیەك ئەنجام دەدەن مایەی دڵخۆشیو مژدەبەخشی پاشەرۆژێکی روناکترو گەشاوەترە، وتاری ئایینیو ئامۆژگاری بۆنەکانی ئیسلامی ئەوەندە رەگی داکوتاوە لە خاکی کوردستاندا بەزریان و گەردەلول و گێژەلۆکە نانەویو لەبن نایەو وشك نابێت، چونکە زانای کورد سەنگەری لەشاخەوە بۆ شارو لە چەکەوە بۆ قەڵەم و لەخوێندنەوە بۆ زمان گواستۆتەوە، زۆرمان دیمەنی ناشیرین و نامۆ لەبەر چاوە کە بۆ ئافەرین و دەردی گرانی نائومێدی هەوڵدەدرا کورد لە ئایین دوور بکەوێتەوە لە رێگەی دوورکەوتنەوەی زمانەکەی خۆی لە ئایینی (چونکە وتار لە دڵەوە دێت و زمان نوێنەرە)، بۆیە ئێمە لە رووی متمانەو باوەڕەوە داوا لەهەموو زاناو دانایەکی کورد دەکەین ئەزمونی کورد دەوڵەمەند بکەن، قورئانی پێ ئاشنا بکەن، شارەزای ئایینی بکەن، کەڵك لە گەنجینەی زمان و فەرهەنگی ئیسلامی وەربگرن بەهەستی ناسك و بیری قوڵ و قەڵەمی رەوان بەکوردیو بەکورتی خزمەت بەزمان و قورئان و ئایین بکەن و گۆڤاری خۆری ئیسلام سەرچاوەی زانیاری بێت بۆ نەوەی نویو پاشەڕۆژ، خواش یارمان بێت.





# ساتێك لەسایەی قورئاندا

مامۆستا ئاری

﴿وَمَنْ تَزَكَّى فَإِنَّمَا يَتَزَكَّى لِنَفْسِهِ وَإِلَى اللَّهِ الْمَصِيرُ﴾ (سورة فاطر/ ١٨) هەر کەس پاك بێت سوودی خۆیەتی.

ئەم ئایەتە پیرۆزە بەرزترین و جوانترین ئاماژەی تێدایە کە مرۆڤ خۆی پەروەردەو پاڵفتە دەکات و هەر کارێك لەم بارەوە کە ئەنجامی دەدا، سوودو قازانجی بۆ خۆیەتیو پاداشتی بۆ خۆی دەگەڕێتەوە، ڕەوشت و نەریتی کۆمەڵ هەمیشە بڵاو دەبێەوە بۆ تاك و دەبێ مرۆڤ ئاگاداری دەوروبەری خۆی بێت بۆ ئەم مەبەستە ئەم نموونە دەگێڕینەوە: منداڵێکی بێ باوك لەدەوروبەری شارێك دەژیاو پێ نەگەیشتبوو بۆ کاروباری ژیان، لەبەر ئەوە وازی لەخوێندن هێناو، لەسەرەتای ژیانییەوە بەرۆژو بەشەو کاری کوڵ بارکردنی دەکرد لەشاردا ، بۆ ماوەیەك بڕێ پارەی دەستکەوت و بەو پارەیە ژنی هێناوبوو بەخاوەن ماڵ و منداڵ، بەڵام هاوڕێی نەفس نزم و خراپەکار ڕێگەی شەڕیان فێرکردبوو لەچاکە دووریان خستبووەوە، هەرچی دەستدەکەوت لەکاری بەدرەفتاری سەرفی دەکرد.

خێزانەکەی کە ژن و دوو کوڕو سێ کچی هەبوو زۆر بەناخۆشیو هەژاری دەژیان و بۆ نانی شەو کەم دەست بوون، ڕۆژێك کوڕە گەورەکەی تووشی نەخۆشی بوو دەبوو نەشتەرگەری بۆ بکەن، لەبەر ئەوە پیاوەکە توانای کارکردنی نەبوو و سەرگەرمی بڕێ پارەبوو بۆ نەشتەرگەری کوڕەکەیو خەرجی منداڵەکانی، کابرا زۆر پەشۆکابوو و داماوبوو چاوەڕوان بوو بەیانی کوڕەکەی نەشتەرگەری بکرێ، هەموو خێزانەکە هەژاریو داماوی خۆیان لەبیر کردبوو لەبەر کوڕەکەیان باوکە لەماڵەوە هاتە دەرێو نەیدەزانی ڕوو لەکوێ بکات، لەم کاتەدا تووشی هاوڕێیەکی منداڵی خۆی بوو پاش هەواڵ پرسین و چاك و چۆنی هاوڕێکەی داوای کرد پێکەوە لەمزگەوت نوێژەکەیان بکەن و پاش ئەوە خودا کارەکەیان ئاسان دەکات. لەمزگەوتدا ڕێکەوت پێش نوێژی مزگەوت کورتە باسێکی بۆ باوەڕداران خوێندەوەو لەناوەڕۆکی گوتارەکەیدا فەرموودەیەکی باس کرد کە پێغەمبەر بە (ابن عباس)ی فەرموو: ﴿یاغلام احفظ اللە یحفظك، احفظ اللە تجده تجاهك اذا سألت فاسئل اللە واذا استعنت فاستعن باللّه واعلم ان الامة لو اجتمعت على ان ينفعوك بشيء لم ينفعوك الا بشيء قد كتبه اللّه لك، وان اجتمعوا على ان يضروك بشيء لم يضروك







الا بشيء قد كتبه اللّه عليك، رفعت الاقلام وجفت الصحف﴾ (رواه ترمذي) پاش ئەم گوتارە بەسەرسوڕمانەوە هەستایە سەر پێ و لەشی و بەدەنی هەموو ئارەقەی کردبوو هەستی کرد، لەدەروونیدا جۆرێك متمانەو هێوریو ئارامی پەیدا بووەو خۆی تەسلیم بەخودا کردو هەستی کرد کە هەموو دونیا لەبەر دەستی ئەم پیاوەیەو هەر داواو نزایەك بکا خودا جێبەجێی دەکات، کابرا گەڕایەوە بۆ ماڵ، بەڵام بەرووی گەش و ئارام و متمانەی تەواو لەم کاتەدا لەدەرگای ماڵیان دراو یەکێك لەهاوڕێیانی پیاوەکە بوو و دیارییەکی بۆ هێنابوو تکای لێکرد کە وەری بگرێ، پاش نوێژی شێوان و گەلێ پاڕانەوە لەخودا بەدڵێکی ئارام چاوەڕوانی نەشتەرگەری کوڕەکەی دەکرد خودا بەکەرەمی خۆی بەسەرکەوتووی کۆتایی پێ هێناو، کوڕەکەی گەڕایەوە ماڵەوە.

ئەم ماڵە بەگەڕانەوەی خاوەن ماڵ بۆ لای خوداو رزگاربوونی لەهاوڕێی خراپ و بەدرەفتار خودا بەرەکەت و خێرو خۆشی رۆژی زیاتری بۆ ناردن و ژیانیان چاك بوو دەستی کرد بەپێگەیاندنی منداڵەکانیو پەروەردەیی ئیسلامیو ئایینی رێك و پێك و ئەم خێزانە لەهەژاریو کەم دەستی رزگاریان بوو و هەموویان وەك خێزانێکی بەختەوەر لەژێر دروشمی ئەم فەرمووده: (**خيركم من تعلم القرآن وعلمه**) دەژیان و هەرچی کێشە دەروونیو دەرەوە لەناو خێزان نەمابوو ئەم هەموو خێرو بێرو چاکەیە لەئایەتی قورئان دەستی ئەم خێزانە هەژارەکەوت: ﴿**إِنْ أَحْسَنتُمْ أَحْسَنتُمْ لأَنفُسِكُمْ**﴾ (**سورة الاسراء/ ٧**).




# مزگەوتی گەورەی بەردەڕەش دیاریەکی پیرۆزی حکومەتی هەرێمی کوردستانە بۆ دەڤەری بەردەڕەش

ئا: خەلیل زیوەیی



رۆژی ٢٠٠٢/١/٢٩ بەرێز شێخ عەدنان نەقشبەندی وەزیری ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی و نوێنەری سەرۆکی حکومەتی هەرێمی کوردستان بەیاوەری شاندێکی گەورەی وەزارەتی ئەوقاف و سەرۆك و ئەندامانی مەکتەبی تەنفیزی یەکێتی زانایانی ئایینی ئیسلامیو چەند مامۆستایەکی ئایینی بەرێز لەشاری هەولێرەوە بەرەو دەڤەری ئاکرێ بەرێکەوتن و لەلایەن بەرێزان عومەر عوسمان بەرپرسی لقی ٩ی پارتی دیموکراتی کوردستان و جێگری کارگێرانی لق و قائمقامی ئاکرێو ژمارەیەك لە بەرپرسانی حزبیو حکومیو مامۆستایانی ئایینی دەڤەرەکە پێشوازی گەرم کران. دواتر پێکەوە بەرەو شارۆچکەی بەردەڕەش بەرێکەوتن و لە دەروازەی شارو لەبەردەم مزگەوتی گەورەی بەردەڕەشدا ژمارەیەکی زۆر لەبەرپرسانی حزبیو حکومیو مامۆستایانی ئایینیو قوتابیانی قوتابخانەکانی ئیسلامی لەپێشوازیدابوون، پاشان لەرێورەسمێکی شایستەدا بەرێز شێخ عەدنان نەقشبەندی مزگەوتەکەی کردەوەو وتارێکی گرنگی پێشکەش کردو ئاماژەی




بەخزمەتی بەردەوامی وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی لەژێر ڕێنماییەکانی ڕێزدار سەرۆکی حکومەت کرد. ئەمەش دەقی وتارەکەی وەزیری ئەوقافە:

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿رَبَّنَا لَا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا وَهَبْ لَنَا مِنْ لَدُنْكَ رَحْمَةً إِنَّكَ أَنْتَ الْوَهَّابُ﴾

صدق الله العظيم

## بەڕێز:
## بەڕێزان زانایانی ئایینی پیرۆزی ئیسلام:

میوانە ئازیزەکان، خەڵکی تێکۆشەری شاهیدی مێژووی پڕ شانازی شاری ئاکرێ، دانیشتوانی شارۆچکەی بەردەڕەشی خۆشەویست.

سڵاوی خواتان لێ بێت ئەم کاتەتان باش:

جێگای خۆشحاڵییە کە ئەمڕۆ لە شارۆچکەی بەردەڕەش و لە جیاتی ڕێزدار سەرۆکی حکومەتی هەرێمی کوردستان کاك (نێچیرڤان بارزانی) مزگەوتی گەورەی بەردەڕەش بکەینەوە، کە پێش ساڵێك لەم جێگا پیرۆزەدا هەموو لایەك پێکەوە بەردی بناغەمان دانا، بەبڕی نزیکەی (٢)ملیۆن دینارو هەر لەسەر فەرمانی بەڕێزیشی وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی لە حکومەتی هەرێمی کوردستان و هەموو دام و دەزگاکانی کوردستان شانازی بەوە دەکات کە شەرەفی خزمەتکردن بە ئایینی پیرۆزی ئیسلام و، شوێنە پیرۆزەکان و زانایانی بەقەدری ڕێبازی پیرۆزی حەزرەتی محەممەد (د.خ) پێ سپێردرابێت، بەوەش بەشداربێت لە ئاوەدانکردنەوەی کوردستانی خۆشەویست شان بەشانی دەزگاکانی تری حکومەتی هەرێمی کوردستان و، بێ شەك ئەو ئاوەدانکردنەوە ئەرکی سەرشانی هەموو لایەکمانە بۆ ئەوەی نەوەی تازەمان بەسەربەرزیو سەرفرازیو ئاسوودەیی لە وڵاتی خۆیاندا بژین، وەکو ئەرکێکی نیشتمانیو قەرەبووی ئەو هەموو تاڵیو سوێرییەی کە میللەتی کورد بەدرێژایی مێژوو چێشتوویەتی، باجی گرانی بەرگری کردن لەخاك و وڵات و مافی نەتەوەیەکی بەشخوراوو ستەمدیدە.

ئومێدەوارم ئەم مەڵبەندە پیرۆزەی عیبادەت و خواناسییەی ئەمڕۆشمان لەکاتێکدا کە ئەچێتە پاڵ پرۆژە جۆراو جۆرە پڕ سوود و خزمەتگوزارییەکانی کابینەی حکومەتی هەرێم لەهەمان کاتدا مینبەرە پیرۆزەکەی ببێتە هۆی پەخش کردنی ڕێنماییو ئامۆژگاری باش بۆ موسڵمانان بۆ ئەوەی وانەی کورد پەروەریو نیشتمان پەروەریان فێرکەن شان بەشانی وانەی ئایین پەروەری، بەمەرجێك ئەو ڕێنماییانە هەڵقوڵاوی سەرچاوەی روون و پاکی ئایینی پیرۆزی ئیسلام بن، کە بریتییە لە قورئانی پیرۆزو فەرموودەکانی پێغەمبەری مەزن(د.خ).

*ئامادەبووانی بەڕێز:*

لای هەموو لایەك شاراوە نییە، بەڵکو زۆر روون و ئاشکرایە کە سەرکردایەتی پارتی دیموکراتی کوردستان، کە رابەرایەتی ئەم تەجربە دیموکراتییە دەکات لە هەرێمدا هەردەم خزمەتکردن بە ئایینی پیرۆزی ئیسلام و شوێنە ئایینییەکان و زانایانی ئایینی بەقەدر لە ئەولیاتی سیاسەتی خۆیدا دادەنێت، ئەوەش شتێکی تازە نییە، بەڵکو تەرجەمەیەکی راستگۆیانەیە بۆ ڕێبازی پیرۆزی بارزانی نەمرو، سەرۆك مەسعود بارزانیش بە ئەمانەتەوە هەڵگری ئاڵای ئەو ڕێبازە پیرۆزەیە، بۆیە هەر کەسێك ئایین پەروەری- کەشانازی پێوە دەکەین- لە کورد پەروەری جیابکاتەوە مانای ئەوەیە کە لە جەوهەری




ئـــاييني پـــيرۆزی ئيســـــلام نەگەيشـــتووە يـــان نايـــەوێت تێبگات، بۆيە ئێمە لێرە تاكيدی ئـەوە دەكـەم (كـە مرۆڤـی ئـايين پــــەروەر ئـــــەبێ نيشــــتمان پـەروەريش بێــت)، لای هــەموو لايەكيشمان ئاشكرايە كە رابـەرە يــــەك لەدوايی‌يەكــــــەكانی گەلەكەمان لـەپێناو مـافی رەوا و حـەقی خـوراوی ميللەتەكـەمان، هـەر لـە شێخی نەهرييـەوە، تـا شێخ عەبدولسـەلامی بـارزانی، شــێخ مــــەحمودی حــــەفيدو پێشـــەوای شـــەهيد قـــازی محەممـــەدو، بـــارزانی نـــەمر گۆشـــكراوو پـــەروەردەی نـــاو مزگەوتـە پيرۆزەكانی كوردسـتان بوون.

*زانايانی ئايينی بەرێز:*

پاراستنی ئـەم ئەزموونـەی كوردســـــتان و خزمــــــەتكردن بــــەگەل و نيشـــتمان ئـــەركی هــــــەموو لايەكمانــــە، بــــەلام ئـەركی ئێوەی بـەرێز ئـەركێكی مضاعفه.

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿ قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لاَ يَعْلَمُونَ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُوْلُوا الأَلْبَابِ ﴾

صدق الله العظيم

لە كاتێكدا دوای زياتر لـە ١٠ ســـاڵە كـــە ئـــەم ئەزموونـــەی كوردستان رۆژ لەدوای رۆژ بەرەو پێشەوە دەچێت و ميللەتەكەمان بەسەرفرازييەوە لـەژێر سێبەری پەرلـــەمانی كوردســـــتان كــــە نوێنەری راستەقينەی خۆيەتی‌و، حكومەتــە خۆماڵييەكـــەی، كـــە ســــەرقاڵی ئاوەدانكردنــــەوەی كوردســتانەو خزمەتكردنــە بــە گەلــە خەباتكەرەكـــەی، چ لـــە ئاســتی نـــاوەوە چ لـــە ئاسـتی دەرەوە لـە رێگـــای ئـــەو هەولـــە ديبلۆماسييە سـەركەوتوانە، كـە خۆی لە گەشتە پڕ سوودەكانی بـەرێز سـەرۆكی حكومــەت كـاك نێچيرڤان بارزانيدا ئـەنوێنێ، ئـا لـەم كاتــەدا، خــەڵقانێك هــەن لـە دەولـەتانی دراوســێ بەمــەرامی تايبــەتی خۆيـــان هـــەوڵدەدەن نەوعـە شـكوكيەتێك بخەنـە سـەر هەلوێست و داخوازييە رەواكانی گەلەكـــەمان، كـــە خـــۆی لـــە فيدراليــــەتيدا دەنوێنـــێ، لـــە چوارچێـــــوەی عـــــێراقێكی يەكگرتووی (ديموكراتيدا)، بۆيە ئەركی سەر شانی ئێوەی بـەرێزە كــــە لـــــە رێگـــــای مينبــــەرە پيرۆزەكانتـــان راســـتييەكان بـــە جەماوەری گەلەكەمان بگەينن بۆ ئەوەی ميللەتی ئێمـە لە ئێـوەوە زيـاترو زيـاتر وانـەی نيشـتمان پەروەری فێربێت و بزانێت چۆن داكۆكـی لـە مـافی رەوای خـۆی دەكات، وەكو هەڵوێستێكی وەها كـە خـودای پـەروەردگارمان لێ رازی بێـت و لـە رێگـای ئێـوەی بـەرێزەوە يـەكريزی‌و برايـەتی‌و تـــەبايی‌و ئاشــــتی لــــەناو ميللەتەكەماندا بچێنن. بۆ ئەوەی گيانی شەهيدە سەربەرزەكانمان لە ئارامگاكانياندا بەئاسوودەيی ســەربنێنەوە. لــەكۆتاييدا لــە خودای پەروەردگار داواكارم كە بـــەلوتف و رەحمـــەتی خـــۆی رعايـەتمان بكات و پشتيوانيمان بكات بۆ خزمـەتكردن بـە گـەل و نيشتمان، لە هەمان كاتدا بتوانين لە رێگای حكومەتی خۆمانەوە بە چاكــترين شــێوە خزمـــەت بـــە ئاييني پـيرۆزی ئيسـلام بكـەين، دوور لە هەموو توندو تيژييـەك، كــە بەپێچەوانـــەی عـــەقيدەی پيرۆزی ئيسلامە.

واخر دعوانا ان الحمـد لله رب العالمين، والصلاة والسلام على المبعـوث بـالحق (محمـد) عبـده ورسـوله (صلـى الله تعـالى عليـه وسـلم) وعلـى الـه واصحابـه الى يوم الدين.

والســـلام عليكـــم ورحمـــة الله وبركاته.





# شانازی بە ئازادی کوردستانەوە دەکەین و سەرۆك بارزانیش لەهەر کەس زیاتر خەمخۆری موسڵمانانی کوردستانە

راپۆرت: کوردەوان مەحمود

بۆ وەڵامدانەوەی چەند پڕوپاگەندەیەك لەسەر دەنگ و باسی بڵاوکردنەوەی مەسیحییەت لەلایەن خەڵکانی دەرەوەی عێراق و هەوڵی لەکەدار کردنی ڕەوشی ئایینیو پێکەوە ژیانی برایانەی نێوان ئایین و نەتەوەکانی کوردستان و بارودۆخی مزگەوت و کەنیسەکانی کوردستان. ڕۆژی سێ شەممە ٢٠٠٢/٢/٤ رادیۆی ئەوروپای ئازاد لە (پراغ)ەوە پەیوەندییەکی راستەوخۆی لەگەڵ بەڕێز شێخ عەدنان نەقشبەندی وەزیری ئەوقاف و کاروباری ئیسلامیکردو چەند پرسیارێکی ئاراستەکرد.

سەرەتا وەزیری ئەوقاف ئەو پڕوپاگەندانەی بەدرۆخستەوە کە گوایە چەند کەسێك لە دەرەوەی عێراقەوە هاتوون بۆ بڵاوکردنەوەی مەسیحییەت و لەم بارەیەوە گوتی: ئێمە لە کوردستان لەگەل برا مەسیحییەکاندا بە ئازادی دەژین و حکومەتی هەرێمی کوردستان زۆر بە پەرۆشەوە دەڕوانێتە فرە ئایینیو ڕێز لە شوێنە پیرۆزەکان دەگرێت، جا ئەگەر شتێکی لەم جۆرە هەبێت ئەوا برا مەسیحییەکانی کوردستان دەتوانن بەو کارە هەڵسن، نەك چەند کەسێك کە هەزاران کیلۆمەتر ببڕن و بێنە کوردستان بۆ بڵاوکردنەوەی مەسیحییەت، دیارە برا مەسیحییەکان لە هەولێرو دهۆك و شارەکانی دیکەی کوردستان کەنیسەو شوێنی ئایینی خۆیان هەیەو ئازادانە لەگەڵ هەموو خەڵکی کوردستاندا دەژین و ئێمەش وەك وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی هەردەم لەبۆنە جیاجیاکانی برا مەسیحییەکاندا پیرۆزباییان لەگەڵدا ئاڵوگۆڕ دەکەین و مەترانی عەنکاوەش کە لەشاری هەولێری پایتەختی فیدرالی هەرێمی کوردستاندایە هەردەم ستایشی ئەو ڕێز گرتنە دەکات، کە لەلایەن موسڵمانانی کوردستان و وەزارەتی ئەوقافەوە لێیان دەکرێ.

سەبارەت بە ڕەوشی ئایینیو بارودۆخی مزگەوت و کەنیسەکان لەسەردەمی کاولکاری کوردستان و لەکاتی ئاشتیو لەسایەی پەرلەمان و حکومەتی هەرێمی کوردستان، بەڕێز شێخ عەدنان نەقشبەندی گوتی: شتێکی سەرسوڕهێنەر نییە ئەگەر لەکاتی بۆردومان و جەنگدا مزگەوت و کەنیسەو خەڵکی مەدەنیش ببێتە قوربانی







نموونەی زیندووش ئەفغانستانە کە سەرەڕای هەوڵی گەورەی نێوەندەکانی مافی مرۆڤ، بەڵام لەکاتی بۆردومان و جەنگدا خەڵکی مەدەنیو مزگەوت و پەرستگاکان زیانیان لێکەوت. من بەرپرسیاریەتیم بواری ئەوەم نادا کە بزانم چەند مزگەوت و کەنیسە لەکاتی شەڕی دووەمی کەنداودا لەکوردستان روخاوەو زیانی پێکەوتووە بەڵام ئەگەر شتێکی لەو جۆرە بوویێت، ئەوا بەسەرسوڕمانی نازانم لە کوردستانی عێراقدا هەر لە دوای راپەڕینە مێژووییەکەی بەهاری ١٩٩١و دامەزراندنی پەرلەمان و حکومەتی هەرێمی کوردستان. سەرۆك مەسعود بارزانی پەیتا پەیتا رێنمایی داوەو هەوڵی داوە بۆ پێشکەش کردنی باشترین خزمەت بەمزگەوت و شوێنە پیرۆزەکان و لەهەر کەسێك زیاتریش خەمخۆری موسڵمانانی کوردستانە. لە شۆڕشی ئەیلولی مەزنیشدا بەڕابەرایەتی بارزانی نەمر هەمیشە خزمەتکردن بە ئایینی پیرۆزی ئیسلام و ڕێز لێنانی زانایانی ئایینی ئیسلامی کوردستان لە ئەولەویاتی بەرنامەو کاری ئەو سەرکردە نەمرەو شۆڕشە مەزنەکەیدا بووە، بارزانی نەمر هەمیشە گیانی ئاین پەروەریو کورد پەروەری لەناو جەستەی موسڵمانانی کوردستاندا بەهێز کردووەو ڕێزیشی لە برا مەسیحییەکان و تایبەت مەندییە ئایینیو کۆمەڵایەتییەکانیان گرتووە. لەبەشێکی‌تری چاوپێکەوتنەکەیدا وەزیری ئەوقاف ئەو پڕو پاگەندانەی بەدرۆخستەوە کە لەلایەن رۆژنامەی (بابل)ی عێراقییەوە بڵاو کرابووەوە گوایە لەوتاری وتارخوێنی مزگەوتەکان دوعایان بۆ سەرۆکی عێراقی کردبێت، لەمبارەیەوە بەڕێزیان گوتی: ئێمە وەك وەزارەتی ئەوقاف هەرگیز دەست لەکاروبارو ناوەرۆکی وتارەکانی مامۆستایانی ئایینی ئیسلامی بەڕێز لە کوردستان وەرنادەین ، چونکە عەقیدەمان وایە کە مینبەری مزگەوتەکان مینبەری پێغەمبەری رابەر محەممەد ئەلمستەفان و (د.خ) پێویستە ڕێزیان لێبگیرێت. بەڵام بە هەموو ئەو (عەقڵ نەخۆشانە) دەڵێم: کە ئەم پڕو پاگەندانە بڵاودەکەنەوە، ئێستا کوردستان گەیشتۆتە ئاستێکی بەرزی هۆشیاریو رۆشنبیری. ساڵانی ئازادیش ئەوەندەی پێویست بۆ ئەزموونی هەبووە، کە دانیشتوانی ئەم هەرێمە ئارامە راست و چەپی خۆی لێك جیا بکاتەوەو تەعلیقیش لەسەر ئەم پڕوپاگەندانە بۆ خەڵکی موسڵمان و کورد پەروەری کوردستان بەجێ دەهێڵین.





# تــــــــەجرید و تـــــــەئویل لـــــــە دەقـــــــی قورئـــــــاندا

۲ لە ۳

ن: ئەکرەم عەنەبی

## مێژوو و هۆکارەکانی تەشخیس لەدەقەکانی پێش قورئاندا

لەبەشی یەکەمدا لەهەردوو بەشی چەمکی تەجریدو تەئویل و پەیوەندییان لەگەڵ گوتاری گەردوونیو مێژوویی دەقی پیرۆزی قورئاندا دواین و پەیوەندی هاوڕێکی تەجریدو گوتاری گەردوونیو، دەستنیشان کردن (تشخیص)و گوتاری مێژووییمان خستە روو، لەو پرۆسەیەش دواین کە دەقی موجەڕەدی پێ دەخوێندرێتەوە.

بێگومان دەق و دیاردەو رووداوە موجەڕەدەکان کات و شوێن (شوێنکات- زمکان) کاڵیان ناکاتەوە، بەپێچەوانەشەوە دەق و دیاردەو رووداوە دەستنیشان کراوەکان شوێنکات لەبیریان دەباتەوەو دەبنە مێژوو. هەر ئەو رووداوەی بەر لە چەندین سەدە بۆتە موعجیزە پەرجو- یەکی دیارو هەستپێکراو، ئەمڕۆ تەنانەت شوێنەوارەکانیشیان نەماوە. هەر بۆیەش یەکێك لە سیما هەرە دیارەکانی ئایینەکانی پێش ئیسلام و کتێبەکانی پێش قورئان-بەزۆری- بە بەڵگەی دەستنیشانکراو دەقی دەستنیشانکراو چنرابوون، کە دەکرێ ئەم دەستنیشان بوونەشیان بووبێتە مایەی قۆناغ بەندی بوونیان، چونکە گشت ئایینەکانی پێش ئیسلام بەهاتنی ئایینی پاش خۆیان سەردەمیان بەسەر دەچێت و ئیدی تەنانەت دەقەکانیشیان لەنێو تەونەکانی زەمەندا کاڵ دەبێتەوەو بەجێ دەمێنێ.

بەڕای من هۆکاری سەرەکیو جەوهەری بەجێمانی دەق و گوتارەکانی پێش ئیسلام نەبوون یاخود کەمی دەقی موجەڕەدو گەردوونی بووە لە کتێبەکانی ئەواندا، تەنانەت باس و دیاردە موجەڕەدەکانیش هەر بە دەستنیشانکراوی خراونەتە روو، بەشێوەیەکی کە لەبیرکردنەوەو عەقڵی مرۆڤی سادەو ساویلکەشدا هەر دیارو ئاشکرابوون، گەر لە باسێکی موجەڕەدی وەك هۆکاری هاتنە سەر زەوی مرۆڤ لە بەهەشتەوە وردببینەوە، ئەوا لە رواڵەتدا زۆر بە سادەییو دەستنیشانکراوی بەردیدەمان دەکەوێت، هەتا بەرەو سەرەتای وەحیش بگەڕێینەوە (چ لەلایەن خوداو چ لەلایەن مرۆڤیشەوە) دەستنیشانکراوی زیاترمان بەرچاو دەکەوێت، دەکرێ گرنگترین دەستنیشانکراوییەکانی ئایین لە پەرجو (موعجیزە)دا ببینین، لە راستیشدا پەرجو ئەو بەڵگە روون و ئاشکرایەیە، کە لە ئایینەکانی بەر لە ئیسلامدا لەهەموو کات و شوێنێکدا ئامادەییەکی بەرچاوو دەست و بردی هەبووە، هەر لەسەردەمی ئادەم (د.خ) و لەبەهەشتدا بە روونی بەرچاو دەکەوێت، کاتێك خودا پێیان دەفەرموێت لەو درەختە نزیك مەبنەوەو بەرەکەی مەخۆن، لێرەدا گوێڕایەڵی خودا تەنیا لەنەخواردنی بەری درەختێکدا بووە، کە دەستنیشانکراوی مادی بووەو رۆژانە بینیویانەو دۆستایەتیو




# شوێن و کات دیاردەو رووداوە موجەرەدەکان کاڵ ناکاتەوە

دراوسێیەتییەیان کردووە بوونی باوەڕو گوێڕایەڵی کردنی وەك (غەیب و ئاخیرەت و بەهەشت و جەهەننەم و نوێژو... هتد) لە ئارادا نەبووە. لەکاتێکدا لە ئایینەکانی دواتردا بەتایبەتی ئیسلام ئەو مەسەلە ماددیانە وجودی نەما: پاشانیش نیشانەی رازیبوونی خودا لە کورەکانی ئادەم زۆر دەستنیشان کراوو مادی بوو، بەو پێیە قوربانی لە شوێنێك دادەنرێت و خودا هەر کامیانی قبوڵ کرد بۆ خۆی دەبات، ئەگەرنا دەیگێڕێتەوە، تەنانەت ناردنی فریشتە ئاگادارکەرەوەکان بۆ سەر زەوی تا سەردەمی حەزرەتی ئیبراهیم (د.خ) هێندە بڵاوبوو، کە قەومەکەی نوح (د.خ) باوەڕیان نەدەکرد خودا لە رێگەی مرۆڤەوە پەیوەندی بە مرۆڤەوە بکات و دەیانوت: ﴿**وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ لَأَنزَلَ مَلَائِكَةً مَّا سَمِعْنَا بِهَٰذَا فِي آبَائِنَا الْأَوَّلِينَ**/ سورة المؤمنين-٢٤﴾[١]

گەر لە موعجیزە دیارو دەستنیشانکراوە بێ شومارو زۆرەکانی مێژووی ئایینەکان وردبینەوەو بمانەوێ بیانخەینەڕوو، ئەوا بە چەند سەد لاپەڕەیەکیش کۆتایی نایەت، بەڵام خوداو موعجیزە ئامادەییەکی راستەوخۆو دەستوبردیان لە ئاراستەکردن و راستکردنەوەو بڕینەوەی گومانی خوا پەرستان و لەناوبردن و سزادانی بێ باوەڕەکاندا هەبووە. لەکاتێکدا لە ئایینی ئیسلامداو بەتایبەتی پاش مردنی پێغەمبەر (د.خ) ئەو ئامادەییە راستەوخۆیە کەمتر بەرچاو دەکەوێت، لەناوبردنی خێڵی نوح و عادو سەمودو... هتد لە سزا ئامادەکانی خودای گەورەن و هەمووان بەچاوی خۆیان دیویانە، موعجیزە گەورەکانی ئیبراهیم و موساو عیساو عوزێرو سولەیمانیش لە دیارترین ...ستەکردنەکانی خودان، تەنانەت کاتێك

حەزرەتی ئیبراهیم داوا لە خودا دەکات، کە چۆنیەتی زیندوو کردنەوەی پیشان بدات بەشێوەیەکی زۆر دیار خودا پێی دەفەرموێت، کە چوار باڵندەی جۆراو جۆر ماڵی بکاو پاشان هەنجن هەنجنیان بکەو تێکەڵاوی یەکتریان بکەو هەر بەشێکیان لەسەر کێوێك دابنێ‌و پاشان بانگیان بکە، هەریەکەیان بە زیندووی دێنەوە بۆ لات[٢]. بڵێی چ موعجیزەیەك لەوە گەورەتر بووبێت، کە خوا عەسایەکی دەستی موسا بکاتە مارو دەستێکی ئاسایی بکاتە دەستێکی درەوشاوە، یاخود زیندووکردنەوەکانی حەزرەتی مەسیح و پاشان ئەو گومانەی لای حەزرەتی عوزێرو ئەسحابی کەهف دروست بوو، کە خودا بۆ رەواندنەوەیان حەزرەتی عوزێری سەد ساڵ مراندو[٣] ئەسحابی کەهفیشی ٣٠٠ ساڵ خەواندو پاشان زیندووی کردنەوە[٤]. بەدرێژایی سەردەمەکانیش سزاکان ئامادەییان هەبووە، ئیدی هەر لە قبوڵنەکردنی قوربانییەکەی قابیل و لافاوی سەردەمی نوح و لەناوبردنی خێڵەکانەوە تا فیرعەون و نەخۆشییە یەك لەدوای یەکەکانی ئیسرائیلیەکانەوە درێژ دەبێتەوە.

دەکرێ گرنگترین هۆکاری دەستنیشان بوونی دەق و موعجیزەکانی پێش ئیسلام بۆ سادەیی خەڵك و فراوان نەبوونی هزرو تواناکانی بیرکردنەوەی زۆرینەی خەڵك بەتایبەتیش لە مەسەلە نادیارەکانی ئاییندا بگێڕینەوە، چونکە بێ گومان هزری مرۆیی‌و توانا تەکنۆلۆژی‌و ژیارییەکان لەسەر دەمە جیاجیاکانی ژیانی مرۆییدا گەشەیان کردووەو پێشکەوتنەکان هەر لە




سەرەتاوە لە دەستی مرۆڤدا نەبووە، هەر ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی ئاسۆی بیرکردنەوەی گەلێ تەسك بێت، تەنانەت لە ئایینی ئیسلامیشدا ئەو وتانەی کە ئاماژە بە (چین) دەکات وەك دوورترین شوێنی دونیا (اطلب العلم ولو بالصين) لەو ئاسۆیەوە سەرچاوە دەگرێت ئەگەر نا (چین) دوورترین جێگەی دونیا نەبووە، یاخود جیهانبینی کەسێکی سەردەمی گوندی مەدینەو ئەو ژیارە سەرەتاییەی ئەو کاتە سەبارەت بەبەهەشت و کۆشك و تەلارەکانی زۆر جیاواز دەبێت لە جیهانبینی موسڵمانێکی خەڵکی- واشنتن-ی سەردەمی تەکنۆلۆژیا.

بەهەر حاڵ لێرەدا باس لەوەیە کە هزرو جیهانبینیو تواناکانی مرۆڤ کۆدێتا-انقلاب-ی نییەو لەپڕ نایەتە ئارا، هەروەك چۆن لە پڕیش ئاوا نابێت، بەڵکو بە پلە پلەو لە ئەنجامی تێپەڕینی کات و ئەزموونەکان کەڵەکە دەبێت. دەکرێ سادەیی هزریو کەمی توانا ژیارییەکان بەخەسڵەت و سیمایەکی مرۆڤی جاران بزانین و لەوەش دڵنیاین کە خودا بەزمان و داب و نەریت و ئاستی هەر نەتەوەیەك پێغەمبەریان بۆ رەوانە دەکات[٥]، هەر بەمەش ئیدی موعجیزەو تەنانەت دەقەکانیش پابەند دەبن بەو نەتەوەو هۆزەوەو لەئاستی جیهانبینیو هوشیاری ئەواندا دەبێت. ئەو خەسڵەتە گەورەیەش کە لە سادەیی خەڵکدا دەردەکەوێت نەتوانینی بڕواکردن بووە بەنەبیراوە دەستنیشان نەکراوە موجەڕەدەکان. هەر بۆیە لە سەردەمی نوحدا دەکرێ هێندە سادەیی بووبێتە مایەی بڕوا نەهێنان بە نوح ئەوەندە ملهوڕیو کوفر مایەی لادانی ئەوان نەبووبێت، تەنانەت ئەم سادەییە ئەوەندە بەرفراوان بووە خودی پێغەمبەرو رابەرە خوانەناسەکانیشی گرتۆتەوەو[٦] گومانیان هەبووەو داوای موعجیزەی دیاریان کردووە، لەکاتێکدا لەنێو موسڵمانەکاندا ئەم گومانە کەمتر وروژێنراوە، تەنانەت لەکاتی میعراجدا کە موعجیزەیەکی نا دیاری غەیبییە بە ئەبوبەکر (خوا لێی خۆش بێ) یان وت: محەممەد (د.خ) وا دەڵێ بەبێ دوودڵی وتی: راست دەکات، یاخود گەورەیەکی وەك حەزرەتی عەلی دەڵێت: (گەر خوداش ببینم لەوە زیاتر ئیمانم زیاد ناکات). سادەیی لە حەزرەتی موسادا گەیشتە ئەو رادەیەی کە داوای لەخودا کرد خۆی پێشان بدات و تا گەڕایەوە لای نەتەوەکەشی خودایەکیان بۆ خۆیان دروست کردبوو دەستیان کردبووە پەرستنی، دەکرێ گشت پەرستنەکانی ئەستێرەو بت و گیاندارەکان بەم هزرە سادەیە بدەینە قەڵەم.

**دەکرێ گرنگترین دەست نیشانکراوییەکانی ئایین لەپەرجودا ببینین**

موعجیزەی پێغەمبەران هێند دەستنیشان کراوبوون تا لە سەردەمی سولەیماندا گەیشتە زاڵبوون بەسەر (با)و لە حەزرەتی مەسیحیشدا گەیشتە زیندووکردنەوەی مردوو، ئیدی هێندە سادە بوونەوە تا خەڵکیو مرۆڤ لە بڕی سوود لێ وەرگرتن زەرەریان لێ کردن و مەسیحیان کردە خوداو کوڕی خودا، ئاخر ئەو کارانەی مەسیح و موساو سولەیمان دەیان کرد هەر لە کاری خودا دەچوون و دوور بوون لەکاری مرۆڤ. بەهەر حاڵ باس لە سوودو زیانی موعجیزەکان ناکەین، ئەوەندەی کە باس لە دیارو دەستنیشانکراوی موعجیزەکان دەکەین و گرنگترین هۆکاری ئەم دەستنیشان بوونەش

داوای عەقڵ و هزرو جیهانبینی سادەی مرۆڤەکانی پێش ئیسلام بوو، هەر ئەم سادەییەش لە هزرو چەمکدا بە چەند جۆرێك لە دەقەکانی پێش قورئاندا وەك -تەورات و ئینجیل وئاڤێستا[7]-دا رەنگی دایەوە:-

جۆری یەکەم: وەك گوترا رادەی هزریو تەکنەلۆژی مرۆڤەکانی پێشوو لە ئاستێکی نزمدا بوو، هەروەها پێغەمبەرو رابەرێکیش بۆ هەر گەل و نەتەوەیەك هاتبێت هەر لەو ئاست و رادەیەدا بووە لە رووی مرۆڤییەوە، هەر بۆیە خوداش بە رەچاو کردنی ئەو ئاستەو لەلایەکی دیکەوە بەپابەند بوونی دەقەکانی پێشووەوە بەکات و شوێن و نەتەوەی دیاریکراوەو، پێکهاتەو چنینی دەقەکانیش دیاری کراوەو بەمەش دەقەکان هێندە

## سادەیی هزری و کەمی توانا ژیارییەکان خەسڵەت و سیمای مرۆڤی جاران بووە

سادەییو دەستنیشانکراوییان پێوە دیارە ئەوەندە تەجریدو دارنراوییان تێدا بەر چاو ناکەوێت، بە وردبوونەوە لە دەقە پیرۆزەکانی پێشوو دەتوانین ئەو راستییە بزانین، بۆ نموونە لە (سفرتکوین)ی تەوراتدا هێندە بە دەستنیشانکراوی لە دروستکردنی گەردوون دواوە، کە بوارێك بۆ تەجریدی ئەو دەقاتە لە بۆتەو سیاقە مێژووییەکەی نەماوەتەوە، هەروەها سەفەرو باسەکانی ئینجیل و رێنماییو وتەکانی نێو ئاڤێستاش تەنیا لە سیاقە مێژووییەکەی خۆیدا دەخوێندرێتەوەو ئەگەرنا جیاوازییەکی ئەو تۆ لە نێوان ئەو دەقانەو دەقی سادەی مێژووییدا بەرچاو ناکەوێت. تەنانەت ئەم دەستنیشان کراویە هەندێ جار هێندە ئامادەیە کە دەقەکان تەنیا لە شایەتێکی مێژوویی دەچن و رەگەزو بنەماڵەی باس لێکراوەکانیش دەخەنە روو، هەروەك ئەوەی خودی سەرکردەو پاشاکان

مێژووییەیان نووسیبێتەوە نەوەك دەقێکی پیرۆزی ئاراستەکەر کە کاری گەلێك لەم مەسەلەیە گەورەترە، من لەم جۆرە پێکهاتە سادەو دەستنیشانکراوەدا جگە لە رەچاوکردنی رادەی هزری مرۆڤ لەلایەن خوداوە هیچ تەفسیرێکی دیکە شك نابەم. بەراستی ئەم رەچاوکردنەش بۆ کاتی خۆی یەکێکی دیکەیە لە نیعمەتەکانی خودا بۆ مرۆڤەکانی کەبۆتە مایەی رەواندنەوەی گومان و دوودڵییەکان، ئەگەرنا زۆرینەی زۆری مرۆڤ بەو هزرە سادەیە توانای پێگەیشتن و قبول کردنی ئەو ئایەتە قوڵ و موجەرەدو نادیارانەیان نییە کە لە دەقێکی پیرۆزی وەك قورئاندا هەن.

جۆری دووەم: لە قورئانی پیرۆزو سەرچاوە ئیسلامییەکاندا بەئاشکرا باس لەو گۆڕانانە دەکرێت کەبەسەر کتێبە پیرۆزەکانی پێش قورئاندا هاتووە[8]. ئەم راستییە هەرگیز ناتواندرێت چاوپۆشی لێ بکرێت. بەڵام لە راستیدا ئەم دیاریدەیە هەمیشە لەبێ باوەڕیو بەپاڵنەرێکی سلبیو نێگەتیڤیو دوژمنکاری ئەنجام نەدراوە، واتە هەمیشە شوێنکەوتووی دوژمنەکانی کتێبی پیرۆز نەیانویستووە کە کتێبی پیرۆز بشێوێنن، بەڵکو دەکرێ قووڵتر لەو مەسەلەیە بکۆڵینەوەو پەی بەو شاراوەیە بەرین کەلە پێشەوە باسمان کرد.

بێگومان بەهۆی سادەیی هزرو مرۆڤ و پابەندبوونی دەقەکان بەشوێنکاتەوەو سادەییو دەستنیشانکراوی لە دەقەکاندا هەبووە. هەر بۆیە لەگەڵ تێپەڕینی کاتداو بەگۆڕانی شوێن و مرۆڤ ئیدی پێویستی دەستکاری کردن هاتۆتە ئارا، پێویستییەك کە زۆرجار حەزو ئارەزوو مەرامە کەسییەکانی تێکەڵاو کراوە.

دەتوانین بڵێین دەستکاری کردنی ئەم دەقانەش چەندین هۆکاری هەبووە کە گرنگترینیان

پابەندبوونی خودی دەقەکان بووە بەشوێنکاتی دیاریکراوی تێپەڕیوەوەو پاشان سادەیی‌و دەستنیشانکراوی دەقەکان، چونکە گەر ناوێکی سەردەمی ئێمە بۆ خۆمان ئاشنا بێت، ئەوا بۆ سەردەمەکانی پاش ئێمە نامۆ دەبێت و تەنانەت ماناکانیش کاڵدەبنەوە یاخود بەیەکجاری ون دەبن، هەر ئەمەش بووە هۆی لادانی ئەو دەقانەو زیادکرنی دەقی‌دیکەی تایبەت بە شوێنکاتێکی دیکەی ئامادەو بەم شێوە چەندین جۆری دەقی پیرۆز هاتۆتە ئارا. لەلایەکی دیکەوە تێکەڵاو بوونی گوتەی پێغەمبەرو رابەرە ئایینییەکان بەدەقی پیرۆز (ئیدی بەهەر مەرامێك بووبێت)و جیا کردنەوەیان هۆکارێکی گەلێك گرنگی دیکەی ساردبوونەوەو دەستنیشان بوونی دەقەکانە، چونکە رابەرێك دەکرێ قسەو گوتەیەك تەنیا بۆبارێکی تایبەت کردبێت و هەموو کات و بارێکی دیکە تەنانەت خۆشی بەگونجاوی نەزانێت، بەلام بەتێکەڵاوبوونی بەکتێبی پیرۆز ئیدی بۆهەتا هەتایە دەمێنێتەوەو دەبێتە بەشێکی کتێبی پیرۆز، بێگومان هەمیشە گوتەی خودا جودایە لە گوتەو قسەی پێغەمبەرو رابەرەکان و هەر بەمەش گۆڕانێکی بەرەو مێژووی چوون بەسەر دەقە پیرۆزەکاندا دێت. جگە لەوەش کە مەرج نییە رابەرەکان یاخود هەموو ئەو وتار خوێن و گوتەبێژانەش لە دڵ و دەروونێکی پاکەوە قسەیان کردبێت و رەنگە بیرو قسەی پێچەوانەشیان تێکەڵاو بە دەقی پیرۆز کردبێ،

**زمان هەمیشە لە گۆڕانی بەرەو ئاسان بووندایە**

یاخود جۆرەکانی گوتاری ئەوان هەمیشە لەیەکترەوە نزیك بووبن، بەم شێوەیەش دەقی پیرۆز دەبێتە چنراوێك لە گوتاری خودایی‌و رابەرە ئایینی‌و تەنانەت دوژمنەکانی دەقی پیرۆزو، مەحاڵ دەبێت لە یەکدی جودا کرێنەوەو سادەیی‌و دەستنیشانکراوی دەبێتە مۆرکێکی هەرە دیاری دەقەکان.

جۆری سێیەم: لەبەرەوپێشچوونی زماندا چەندین راستی‌و سەلمێندراوی زانستی هەیە، ئەوەی لێرەدا سوودی دەبێت دوو راستییە کە یەکەمیان: (زمان هەمیشە لە گۆڕاندایە)و دووەمیان: (هەمیشە گۆڕانی زمان بەرەو ئاسانبوونە). بەم پێیەش هەمیشە زمانەکان دەگۆڕێن و زمانە کۆنەکانیش لەزمانە نوێیەکان ئاڵۆزترن، ئاڵۆزی زمان دیاردەیەکە دەبێتە مایەی سادەیی چەمکەکان. بەو واتایەی هەتا زمان ئاڵۆزتربێت ئەوا چەمکەکان دەستنیشانکراوتر دەبن و لە داڕنین و تەجرید دوور دەکەونەوە، بۆنموونە کاتێك بۆنانی بەیانی بەرچایی‌و بۆ نیوەڕۆ فراوین و بۆ ئێوارە شام بەکاردێت بەئاڵۆزی گۆ دەکرێن، چونکە ناکرێت لەشوێنی یەکتری بەکاربهێنرێن، واتە کاتێك رستەیەکی وەك (بەرچاییم خوارد) دەبینین بەئاسانی کات و چۆنیەتی‌و جۆری خواردنەکە دەستنیشان دەکرێت، بەلام رستەیەکی وەك (نانم خوارد) موجەرەدتر دێتە بەرچاو لەوەی پێشوو.

زمانەکانی پێشوو (بەپێی راستییە زمانییەکان) لە جۆری یەکەم بوون، واتە چەمکەکان دەستنیشانکراوتر بوون و کەمتر بواری تەجرید ماوەتەوە. هەر بەم پێیەش و بەهۆی سەردەمی دەقەکانەوە کە تەورات (٣) هەزار ساڵێك و ئاڤێستا (٢٦٠٠) ساڵێك و ئینجیل (٢٠٠٠) ساڵێك پێش ئێستا نووسراونەتەوە، ئەوا هەمیشە دەقەکانیان دەکەونەوە ژێر ئەو سەلمێندراوە زمانییەوە کە





## لەزمانەکانی پێشوو، چەمکەکان دەستنیشانکراوتر بوون و کەمتریش بوار بۆ تەجوید ماوەتەوە

زمانەکانیان زیاتر توانای دەستنیشانکردنی چەمکەکانیان هەبووە وەك لە دەقی پیرۆزی قورئان کە زۆر دواترە. ئەم راستییە زمانییە ئەو گریمانەیە بەراست دەسەلمێنێت کە لەنێو بۆتەو پێکهاتەکانی زماندا دەقەکانی پێش قورئان تارادەیەکی زۆر دیلی دەستی دەستنیشانکردن و دیاریو ئاشکرایین و بوارێکی گەلێ کەم بۆتەجریدو لەوێشەوە بۆ تەئویل ماوەتەوە، چونکە وەك لەسەرەتاوە گوتمان تەجریدو تەئویل تەواوکەری یەکدین و تەجرید دەبێتە مایەی تەئویل ئەگەرنا خودی تەئویل و دیاردەیەکی خۆرسك نییەو بەبێ بوونی تەجرید نایەتە ئارا، هەربۆیەشە لە دەقەکانی دیکەدا لەبری تەئویل دەستکاری کردن و گۆڕان هاتۆتە ئارا. بێگومان مرۆڤ هەر بەسروشتی حەز بە سادەییو دیاری کردن و تەشخیسی چەمك و شتەکان دەکات و ئەوا خەسڵەتێکی مرۆڤە، هەر بۆیەش موسڵمانەکانیش لەم خەسڵەتە بەدەرنین. ئەمەش بەرەچاوکردنی جۆرو گۆڕان و پێشکەوتنە هزریو تەکنەلۆژییەکان هەر ئەم خەسڵەتەش سادەکردنەوەو دیاری کردنی لە مێژوو و کولتووری ئیسلامیدا سەبارەت بە دەقەکان هێناوەتە ئارا، بەڵام چۆنیەتیو جۆری دەستنیشانکردنەکان جیاوازن لە چۆنیەتیو جۆری دەستنیشانکردنەکان لە کولتورو دەقەکانی پێش قورئاندا (بەپشتیوانی خودا لە داهاتوودا لێی دەدوێین).

### پەراوێز:

١. المؤمنون/٢٤.

٢. سەیری ئایەتی (٢٦٠)ی سورەتی (البقرة) بکە.

٣. سەیری ئایەتی (٢٥٩)ی هەمان سورەت بکە.

٤. سورەتی (الکهف) ئایەتی ٢٥ بێگومان هەموو ئەم نموونانەو چەندین نموونەی دیکەش لە قورئانی پیرۆزدا باس کراون، بەڵام لەبەر کەمی ماوەو شوێن ناکرێ هەموو نموونەکان بخەینە روو.

٥. بڕوانە ئایەتی ٤ی سورەتی (ابراهیم).

٦. لەو کاتەدا کە حەزرەتی ئیبراهیم داوای چۆنیەتی زیندووکردنەوەی لەخودا کرد، یاخود حەزرەتی عوزێر کە گومانی لەچۆنیەتی زیندووبوونەوە کردو ئەسحابی کەهفیش چۆنیەتی سەرخستنی موسڵمانان بەسەر کافراندا.

٧. لێرەدا لەو کێشەیە نادوێین کە ئایا ئاڤێستاو زەردەشت، کتێب و پێغەمبەری خودان، خوێنەری بەڕێز دەتوانێت بگەڕێتەوە بۆ باسی (زەردەشت و ئاڤێستا- دێڕێکی شیکاری رەخنەیی- ئەکرەم عەنەبی، گۆڤاری ژیار ژمارە ٦، ٨ چونکە لەوێدا بە درێژیو بە بەڵگە لەو کێشەیە دواوین.

٨. بڕوانە سورەتی (النساء) ئایەتی ٤٦ هەروەها سورەتی (المائدة) ئایەتی ١٣، ١٤ هەروەها سورەتی بقرة ئایەتی ٧٥





# مەککیو مەدەنی لە قورئانی پیرۆزدا

خۆزان عەبدولوەهاب

ئەم قورئانە مەزنە لە ماوەی (٢٣)ساڵ بۆ سەر سەروەرمان محەممەد(د.خ) دابەزیووە، لەکاتێکدا ئەم مرۆڤە هەڵکەوتووە نەخوێندەواریش بوو ئەمەش ماوەی پێغەمبەرایەتییەکەیەی، کە (١٣) ساڵ لە مەککەو (١٠) ساڵیش لە مەدینەی گوزەراندووە. لەهەردوو ماوەو سەردەمیشدا قورئانی پیرۆز بەشێوەیەکی پچڕپچڕو بەدوای یەکدیدا نەهاتووە، واتە هەرجارەی چەند ئایەتێك هاتۆتە خوارەوە.

زانایانی ئاینیش تێبینی ئەوەیان کردووە، کە ئایەتەکانی مەککە لەناوەڕۆك و شێوازدا لە ئایەتەکانی مەدینە جیاوازن. هەر لەم پێودانگەشەوە قورئانیان بەسەر مەککیو مەدەنی دابەش کردووەو خۆشیان لەسێ دەستەدا دۆزیوەتەوە:

**یەکەم:** مەککی، ئەو ئایەتانە دەگرێتەوە کە لە پێش کۆچکردنی پێغەمبەر (د.خ) دابەزیون، بەڵام مەدەنی ئەو ئایەتانەن، کە لە دوای کۆچکردن هاتوونەتە خوارەوە. جا لە مەدینە بێ یا لەمەککە یاخود لە رێگای نێوان هەردوو شارەکە یا لەکاتی یەکێ لەغەزاکان دابەزی بێت. پێوەریش لەم بۆچوونەدا کاتە.

**دووەم:** مەککی، ئەو ئایەتانەن کە لەمەککە دابەزیون جا چ بەر لە کۆچ بێ یان دوای کۆچ، مەدەنیش ئەوانەن کە لە مەدینەدا هاتوونەتە خوارەوە. ئێرەشدا شوێن بەپێوەر داندراوە.

**سێیەم:** مەککی، ئەو ئایەتانە دەگرێتەوە کە رووی دەمی گوتارەکەی ئاراستەی خەڵکی مەککە بێت و مەدەنیش بۆ مەدینەییەکان. کەواتە پێوەر لێرەدا پێوەری کەسێتییە. بەو واتایەی رووی گوتارەکە لە کێیە. لەلای زانایان تەواوترینی ئەم سێ بۆچوونەش: یەکەمیانە، کەکاتی کردۆتە پێوەر. لەبەر ئەوەی دووەمیان، کەشوێن بەپێوەر دادەنێت، ئەوەمان بۆ دێنێتە پێشەوە، کە قورئان بەم شێوە دابەش کردن و بۆچوونی دیکە هەڵبگرێت، وەك قورئان لە سەفەرو قورئان لە غەزاکان و... هتد. هەروەها دابەشکردنی قورئان لەسەر بنچینەی وتار ئاراستەکردنیش، لەگەڵ ئەو ئامانجەی، کە قورئان لەپێناویدا دابەزیووە یەك ناگرێتەوە. چونکە قورئان دەستوورێکی ئایینی گەردوونییەو بۆ سەرجەم خەڵك هاتۆتە خوارەوە. لەزۆر لە ئایەتەکاندا دەبینین، کە گوتارەکە ئاراستەی سەرجەم مرۆڤایەتی کراوە، نەوەك تەنیا خەڵکی مەککەو مەدینە.

ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز بەشێوەیەکی پچڕ پچڕ بۆ سەروەرمان محەممەد (د.خ) لەماوەی پێغەمبەرایەتییەکەی لە مەککەو مەدینەو هەموو ئەو شوێنانەی بۆی چووە یان پێیدا تێپەڕ بووە دادەبەزی. ئیدی هەندێك لە هاوەڵ و یارانی پێغەمبەر لە زاری پیرۆزییەوە بەپێی مێژووی دابەزینی ئایەتەکان، ئایەتەکانیان دەنووسییەوە، پێغەمبەریش (د.خ) هەموو ساڵێك لە رەمەزاندا ئایەتەکانی کە لەم ساڵەدا هاتبوونە خوارەوە بۆی رێکدەخستن، هەڵبەتە ئەوەش لەرێگای سروش (وحی)ەوە، واتە رێکخستنەکە لە خواوە بوو بەگەیاندنی جوبرائیل سەلامی خوای لەسەر بێت.

# لەلایەن زانایان تەواوترین بۆچوون سەبارەت مەککیو مەدەنی ئەوەیە کات بە پێوەر دادەنێت

کە لەمانگی رەمەزانی هەموو ساڵێك بۆ ئەو مەبەستە دەهاتە لای پێشەوامان محەممەد(د.خ). کاتێکیش پێغەمبەر(د.خ) دوا ساڵی تەمەنی تێپەڕ دەکرد، ئەوەبوو جوبرائیل گشت ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزی بۆ رێکخست و، سەرجەم قورئان بەشێوەیەکی رێك و پێك لەزاری جوبرائیلەوە بەبناگوێی پێغەمبەردا خوێند. ئیدی بەم جۆرە قورئان ئەم شێوەیەی کە ئێستا لەبەر دەستماندایەو باوە بەخۆوەی بینی.

دەبینین لەسەر ئەم رێکخستنە ئاسمانییە ئایەتەکانی مەککەو مەدینە لەزۆربەی سورەتەکاندا بەیەکەوە هاتوون. ئەوەش دەبینین کە هەندێ لە سورەتەکان ئایەتە مەککییەکانی لە مەدەنییەکان زیاترە، یاخود بەپێچەوانەوە. زانایانیش لەسەر ئەم بنەمایە (زۆری ئایەتەکان) ناوی مەککە یان مەدینەیان بەسەر سورەتەکاندا بریووە. بەواتای ئەگەر ئایەتەکانی مەککەی زیاتر بێت، ئەوە ناوی مەککییان لێناوە، سورەتێکیش زۆربەی ئایەتەکانی مەدەنی بێت بەمەدەنی ناویان بردووە، ئەمەش بێ لەبەر چاوگرتنی ئەو کەمە ئایەتانەی لە رووی دابەزینەوە لە زۆرینەی ئایەتەکانی سورەتەکە جیاوازن.

لەبەر ئەوە زانایان لەبەرایی هەر سورەتێك لە قورئاندا بۆ ئەو بڕە ئایەتانەی لە زۆرینەی ئایەتەکان لە رووی دابەزینەوە جیاوازن دەینووسن، بۆ نموونە (سورەتی (البقرة) مەدەنییە تەنیا ئەو ئایەت و ئەو ئایەت و ئەو ئایەتە نەبێ). هەندێك سورەتیش هەیە سەرجەم ئایەتەکانی بەیەکەوە دابەزیووە، وەك سورەتی (الانعام) یان زۆربەی سورەتە کورتەکان، کە ئەو کاتە دیارە مەککیە یان مەدەنی.

زانایانیش تێبینی جیاوازی نێوان مەککیو مەدەنیان، کە لەبابەت و شێوازدا لێك جیادەبنەوە کردووە. بۆ ئەوەی ئەم جیاوازیانەش دەربخەین پێویستە شرۆڤەی دوو خاڵ بکەین:

یەکەم شتیش دەبێ باری دەروونی پێغەمبەر(د.خ) لە مەککەو مەدینە بزانین. دووەمیش: بەبارو دۆخی ژینگەو دەوروبەر، ژینگەی مەککەو ژینگەی مەدینە لەسەردەمی دابەزینی قورئان ئاشنا بین.

لەباری دەروونییەوە پێغەمبەر (د.خ) لە مەککەدا دڵەڕاوکێی پێوە دیاربوو، لەبەر ئەوەی سەروەرمان داوای پەیڕەوی کردنی ئایینێکی تازەی دەکردو، عەرەبەکانیش زۆر بەتوندی رووبەڕووی بوونەوەو بەرپەرچیان دەدایەوە، لەلایەکی دیکەشەوە ژمارەی موسڵمانەکان یەکجار کەم بوو. بەڵام وێڕای ئەوەش پێغەمبەر (د.خ) دڵنیا بووە لەوەی کە خوای گەورە پشتیوانیەتیو سەری دەخات و، ئاڵای ئایینی پیرۆزی ئیسلامیش بەرزو شکۆدار دەبێت بەو هەریو بەڵێنەی پێیدراوە.کەچی ئەو دەیەویست دڵنیابێ لەوەی کەس و کارەکەیو قورەیشییەکان هەوەڵین کەس و دەستە دەبن بۆ دڵ والاکردن و لەباوەش گرتنی، لەوەش بەپەلە بوو و خۆزگەشی بۆ دەخواست.

پێغەمبەر(د.خ) لەپاش کۆچی دوایی ئەبو تالیبی مامیو خەدیجەی دایکی موسڵمانان دڵە ڕاوکێکەی زیاتر بوو. لەبەر ئەوەی دوو لە پشتیوانە هەرە بەتواناکانی لەدەست دا. ئەم دوو دڵیو پەشێوییەی تا دەهات لە زیادبوون دابوو تا ناچار




کرا لە مەککەوە سەرهەڵبگرێ، ئەمەش دوای ئەوەی بێباوەڕەکان هەڕەشەیان لێکردو پیلانێکیان بۆ کوشتنی دارشت، بۆ ئەوەی لەدەست خۆیو بانگەوازەکەی دەربازیان ببێت.

# پێغەمبەر(د.خ) دڵنیا بوو لەوەی خودای گەورە ئاڵای ئایینی ئیسلام بەرزو شکۆدار دەکات

کاتێك پێغەمبەر (د.خ) بۆ مەدینە کۆچی کردو پشتیوانی یاریدەدەر (انصار)ەکانی کە پێشتر موسڵمان ببوون بینی، ئەوانەی ئامادەی خۆیان بۆ قوربانی دان و گیانبەخت کردن لەپێناو بانگەوازەکەی دەربڕی‌و، لەلایەکی دیکەشەوە ژمارەی موسڵمانانیش بەرەبەرە زیادی دەکرد، ئیدی باری دەروونی پێغەمبەر (د.خ) هێور بۆوەو، هەوڵی ئەوەی‌دا کە مەککە بەهێز ملکەچ بکات و کۆمەڵگەیەکی ئیسلامی تازەش پێکەوەبنێ. بەڵام لەبواری ئەوانەی رووی وتارو بانگەوازیان لە مەککەو مەدینە ئاراستە دەکرا، دانیشتوانی مەککە عەرەبی وشك و دڵرەق بوون، لەبیرو بڕواش بتپەرست بوون، هیچ بیانوویێکیشیان بۆ بتپەرستییەکەیان نەبوو، تەنیا ئەوە نەبێ کە ئەمە رێگای باپیرانیان بووە. رکابەری‌و بەرپەرچ دانەوەی پێغەمبەریشیان (د.خ) بەو پێودانگە عاتیفیەبوو، نەوەکو بەئاوەزو عەقل، بەڵکو لەسەر بنەمای هەڵچوونی سۆزەوە بوو، چونکە سەرەرای ئەوەش ئەوان بازرگان بوون و خەم و خەونی گەورەیان پارە کۆکردنەوەو سامان پێکەوەنان بوو، قورئانی پیرۆز بەوە ناویان دەبات کە: ﴿وَتُحِبُّونَ الْمَالَ حُبًّا جَمًّا/ سورة الفجر-٢٠﴾ حەز لە پول و پارەکردن بەسەریاندا زاڵەو گوێیان بەداواو بانگەوازەکەی پێغەمبەر (د.خ) نەدا. بەڵکو لە رووشی وەستانەوەو رەتی نموونەو لایەنە رۆحییەکانیشیان کردەوە، کە داوای لێدەکردن باوەڕ بەخوای تاك و تەنیا بێنن و، بڕوا بەوە بکەن کە دوای ئەم ژیانەی دونیا ژیانێکی دیکەو زیندووبوونەوە هەیە، لە ژیانەکەی دیکە لێپرسینەوە (پاداشت، سزا) هەیە. لەوێ بەهەشت بۆ لەخوا ترسان و چاکەکارانەو دۆزەخیش بۆ کافرو بێباوەڕان.

رکابەری دانیشتوانی مەککە لەبەرامبەر پێغەمبەر(د.خ) رکابەرییەکی زۆر توندو تیژ بوو، لەبەر ئەوەی ئەوان وایان دەبینی، کە پێغەمبەر(د.خ) هەوڵی ئەوە دەدات تەواوی بیروڕا ئایینییەکانیان لەو مەسەل و داب و نەریتانەی لەژیاندا بڕوایان پێیەتی بسڕێتەوەو شوێنەواریان نەهێڵێت. بەڵام لەشاری مەدینەدا پێغەمبەر سێ تایفەی دەبینی:

* تایفەو تاقمی موسڵمانان: ئەوانیش لە یاریدەدەران و کۆچ کردووان پێکدەهاتن، کە برایەتییەکی توندو تۆڵیان لەنێواندا روابوو، گیانی خۆشیان لەپێناو سەرخستنی ئیسلام و پشتیوانی پێغەمبەر تەرخان کردبوو.

*دەستەو تاقمی جولەکەکان:ئەوانەش هەر لەپێش هاتنی ئایینی ئیسلامەوە لەمەدینەو دەوروبەری دەژیان،کە سێ تیرەی سەرەکی بوون: (بني النضير، بني قريضة، بني القينقاع). سەرەتا پێغەمبەر (د.خ) بەشێوەیەکی نەرم مامەڵەی لەتەکدا دەکردن، کەچی ئەوان پیلانیان لەدژی دەگێراو ئاژاوەو ناکۆکیان دەنایەوەو هەوڵی ئەوەشیان دەدا تیرەو هۆزە عەرەبەکانیش لە دژی بوەستن، ئەو حەلە پێغەمبەر(د.خ) هەڵوێستێکی توندی





لەبەرامبەر وەرگرتن و سەرەنجام شەڕی لەگەڵ بەرپا کردن و تا دەرسیدان، لە مەدینەو دەوروبەری کۆتایی بەکارو پیلانەکانیان هێنا.

* تاقمی دووڕووەکان (المنافقون): ئەم دەستەیەش لە مەدینەدا پەیدابوون و لەمەککەدا بوونیان نەبوو، ئەوانە لەسەرەوەو بەئاشکرا ئیسلام بوون، کەچی لەژێرەوەو بەنهێنی کافرو گومڕا بوون. لەپاڵ ئەو سێ تاقمەش وەفدی مەسیحییەکانیش هەبوون، کە دەهاتنە لای پێغەمبەر (د.خ)مشتومڕو موجادەلەیان لەسەر ئایینەکان لەگەڵدا دەکرد، بۆ نموونە شاندی نەجران.

دوای ماوەیەکی کورتیش ململانێیەکی توندو ترسناك لەنێوان موسڵمان و بێ باوەڕەکان سەری هەڵداو، زنجیرەیەك شەڕو پێکدادان هاتنە پێشەوە، دواتر ئیسلام باڵی کێشا بۆ نێو دوورگەی عەرەبیو موسڵمانەکان بۆ بلاوکردنەوەی ئایینە نوێیەکەیان بەرەو ناوچەکانی دەوروبەر ڕۆیشتن، لە ماوەی ژیانی پێغەمبەردا(د.خ) لە مەدینە کاری لەسەر ڕێکخستنی کۆمەڵگەی ئیسلامیدا کرد، کە ئایەتە پیرۆزەکانی قورئان ئەم کاری ڕێکخستنەیان لەسایەیدا ئەنجام دەدراو، ئەحکام و، فەرزە ئایینییەکان خرانە سەرشانی موسڵمانان، تا وەکو بەشێوەیەکی دروست و تەواو فێری ئایینەکەیان بن.

لە ژێر ڕۆشنایی تەواوی ئەم شتانەوە جیاوازی شێوازو بابەتی ئایەتەکانی مەککیو مەدەنی ڕێك خراون. لایەنی بابەتەکانی زۆربەی ئایەتەکانی مەککە لە بازنەی ئوصولی بنەڕەتی ئیسلام، کە پەیوەندارن بە عەقیدەوە دەسوڕانەوە، زیاتر لەوەی پەیوەندارین بەفەرمان و فەرزەکانەوە، دەبینین لە دەوری باوەڕ بەخوای تاك و تەنیاو محەممەد نێردراوو پێغەمبەری خودایەو، هەروەها لە دەوری باوەڕ بە زیندووبوونەوەو، مەرگ و لێپرسینەوە لە دوای زیندوبوونەوەی ئەو دونیایە، پاداشت و سزا دەخولانەوە. یەکەمین بابەتی مەککی قورئان لە بارەی ئوصولی ئیسلامی باوەڕپێکراوی بنەڕەتی دایە (اصول الاسلام الاعتقادية الاساسية).

**پێغەمبەر(د.خ) مامەڵەیەکی نەرمی لەنەتەوە جولەکەکاندا دەکرد. کەچی ئەوان پیلانیان لەدژی دەگێڕا**

وێڕای ئەم بابەتەش چیرۆك و بەسەر هاتەکانی نەتەوە کۆنەکانە، کە چۆن لەبەرامبەر پێغەمبەرەکانیان یاخی بوون و سەرەنجام دووچاری سزاو ناخۆشیو قڕبوون و لەناوچوون هاتوون و ئازارو تەنگ و چەلەمەیەکی زۆریان بەسەردا بارییووە. خوای گەورەش لە گێڕانەوەی ئەم چیرۆکانەدا نیازی لەچەسپاندن و دڵناوخواردنەوەی پێغەمبەر(د.خ) بووە لەلایەك و، لەلایەکی دیکەشەوە بۆ ئەوەی ناخۆشیو کارە خراپەکانی کەس و کارو نەتەوەکەی لەسەر سووك بکات و، لایەنی سێیەمی ئەم بابەتەش بۆ ئەوە بوو، بەوەی بەسەر نەتەوەکانی رابردوو هاتووە، عەرەبە بێباوەڕەکانی پێ بترسێنێ.

لەپاڵ ئەم دوو بابەتەش، هەندێ فەرمانی ئایینی دەبینین کە بەسەر موسڵماناندا سەپاوە، بەڵام بەشێوەیەکی کورتبڕی، لەبەر ئەوەی لەوێدا ڕوونکردنەوەو درێژدادڕی بۆ حوکمە ئایینییە فەرز کراوەکان نییە، بەڵکو تەنیا باسێکی کورت و ئاماژەیەکی خێرایەو بەس.

بەڵام بابەتە مەدەنییەکان: ئەوانیش خۆیان لەسێ بابەتدا دەدۆزنەوە:

یەکەم: روونکردنەوەی زیاتری حوکمە ئایینییەکان و، فەرز کردنی سنوورو یاساو بڕیارە خواییەکان و،ئیدی ڕێنوێنییە ئایینییەکان کە لە مەدینە لەسەر موسڵمانان سەپێندران و، لەکاتێکدا هەندێ لەو حوکم و تەشریعاتانەی کە بەشێوەیەکی کورت لە مەککە هاتبوون درێژتر کرانەوەو روونکردنەوەی زیاتریان لەبارەوە کرا. لەکارە دیارەکانی سەردەمی مەدینەش، فەرزکردنی زەکات و رۆژوو حەج و جیهاد بوون. هەروەها لەو ماوەیەدا حوکم و لایەنەکانی نوێژ کە لە مەککە لەدوای سەفەری پیرۆزی شەوی ئیسراو میعراج فەرز کرابوون بەشێوەیەکی درێژترو ئاشکراتر خرانە روو. هەر لەو ماوەیەش ئارەق خواردنەوە بەیەکجاری حەرام کراو دوا بڕیاری بەسەردا درا. بەم جۆرە دەبینین کە زۆربەی بڕیارو تەشریعاتە ئایینییەکان لەنێو ئایەتە مەدەنییەکانی دوای کۆچی پێغەمبەر لە مەککەوە بۆ مەدینەدا هاتوون.

دووەم: مشتومڕ لەگەڵ جولەکەو مەسیحییەکان، وەکو گوتمان جولەکەکان دەستەو تایفەیەکن لە دانیشتوانی مەدینە، شاندو نێردراوی مەسیحییەکانیش دەهاتنە لای پێغەمبەر (د.خ) بۆ گفتوگۆو مشتومڕ لەسەر ئایینەکان، ئیدی ئایەتەکانی قورئانیش بۆ وەڵامدانەوە لەسەر ئەو گفتوگۆو رەخنە گرتنەیان دادەبەزی، لەبەر ئەوە مشتومڕ لەمەڕ ئایینەکان لە ئایەتە مەدەنییەکان زۆرتربوون، هەروەکو بەسەرهات و چیرۆکی نەتەوەکانی رابردوو لە ئایەتە مەککییەکان زیاتر بوون.

سێیەم: پەردە هەڵماڵین و ریسوا کردنی دووڕووەکان (المنافقين)، بەوەی زیانیان بە موسڵمانان دەگەیاند. قورئانی پیرۆز لەماوەی مەدینەی منەوەرەدا کارو ئەرکی ریسوا کردنی دووڕووەکان و ئاشکرا کردنی نهێنییەکانیان بۆ موسڵمانان بەخۆوە گرتبوو، تا وەکو ئاگاداری خۆیان بن و سڵیان لێ بکەنەوە.

یەکەم سورەت کە لە مەدینە دابەزی، سورەتی (البقرة) بوو، کە تێیدا بەشێوەیەکی دووروودرێژ باس لە(بني اسرائيل)یەکان دەکات، دوای ئەوە سوورەتی (ال عمران) هاتە خوارەوە، کە لەوەدا گفتوگۆ لەگەڵ دیانەکان دەکات و بەدووروودرێژیش باس لە مەسیحییەت دەکات.

ئینجا سورەتی (المائدة) دێت کە لەوێشدا دەبینین کێشەو مشتومڕ لەگەڵ جولەکەو مەسیحییەکان دەکات. بەڵام سەبارەت بە دووڕووەکان لە سورەتی (البقرة)دا ئاماژە بۆ کردنیان دەبینین، پاشان لە سورەتی دواتر ئاماژەکان دەبن بە درکاندن و دەربڕین، لە سورەتی (النساء)یش باسێکی دووروودرێژو راشکاوانە لەبارەی دووڕووەکانەوە دەبیندرێت، سورەتی (التوبة)ش پەردەی لە رووی تەواوی کارەکانیان هەڵماڵی‌و شتە پەنهانەکانی زۆر بە راشکاوی خستە روو. لەبەر ئەو ریسوا کردنەی لەم سورەتەدا هاتووە، سورەتەکە پێی دەگوترێت (الفاضحة). ئەمە لەلایەنی بابەتییەوە بوو کە باسمان کرد. بەڵام لە رووی شێوازەوە بەشێوەیەکی گشتی ئایەتەکانی مەککە

**زۆربەی ئایەتەکانی مەککە لەبازنەی ئوصولی بنەڕەتی ئیسلام دەخولانەوە**




لەگەڵ سۆزو عاتیفە دەدوێن، ئایەتەکانی مەدینەش لەگەڵ عـەقل. لەبـەر ئـەوەی ئایەتـەکانی مەککـە لەبنەڕەتـەوە رووبـەڕووی عەرەبـە بێباوەڕەکـان دەکرانەوە، ئەوانەی کە بەرەنگاری پێغەمبەر (د.خ) دەبوونەوە تەنیا سۆزو عاتیفە پاڵنەرو بزوێنەریان بـوو و هیچ بیرکردنـەوەی لـەدواوە نـەبوو. کـەچی ئایەتـەکانی مەدینـە، لەلایەکـەوە رووبـەڕووی موسڵمانان دەکرایـەوە کـە باوەڕیـان بـە ئـایینێکی تازە هێنابوو، ئەوانەش پێویستیان بە شارەزابوون لە فەرمان و بنەماو دەستوورەکانی بوو، لەلایەکی دیکەشەوە رووی ئایەتـەکان ئاراسـتەی جولەکـەو دیانــەکان بــوو، ئــەوانیش خــاوەنی ئایینــە ئاسمانییــەکان بــوون و باوەڕیــان هــەبوو، زانیارییـەکی زۆریـان لـەبارەی ئـایین لـە ڕێگـای کتێبەکانی خۆیانەوە هەبوو، بۆیە پێویستیان بە مشتومڕ و گفتوگۆی عەقلی هەبوو، بۆ سەلماندنی هەر مەسەلەو بابەتێکیش، لۆژێك و بەڵگەیان گەرەك بوو.

**قورئان لەمەدینەدا نەرێکی ریسوا کردنی دووڕووەکانی بەخۆوە گرتبوو.**

لـێرەدا دەتوانـین بـەم جـۆەر خەسـڵەتەکانی شێوازی هەریەکە لە ئایەتـەکانی مەککـەو مەدینـە دەست نیشان بکەین:

١. کورتی ئایەتەکان.

٢. پشت بەستن بە (سجع)ی کورتی فاسیلەکان.

٣. لەبەر چـاوگرتنێکی روونـی مۆسیقای وشـە توندە ئاوازدارەکان.

٤. زۆری ئاگادارکردنــەوەی ســەرکوتکارانە، بەوەی قورئانی پیرۆز هەڕەشە لە عەرەبەکان دەکات و، تـرس و خۆفـی وەبـەر ناخیـان دەنـا، تەنانـەت کاتێك گوێبیستی ئایەتەکان دەبوون رایان دەکرد: ﴿**كَأَنَّهُمْ حُمُرٌ مُسْتَنْفِرَةٌ*فَرَّتْ مِنْ قَسْوَرَةٍ**/ سورة المدثر-٥٠-٥١﴾ لێرەوە وشـەی (كـلا) لـە ئایەتـە مەککییـەکان کەوتـەوە، وشـەی (كـلا) وەکـو بـاوە ئامرازێکــە لــە ئامرازەکــانی سەرزەنشــت و دڵ راچڵــەکاندن، ئەمــەش شــیاوە بــۆ گوتــاری رووبەڕووبوونەوەی عەرەبە بێباوەڕەکان.

٥. وشــە هیجائییــەکان لەســەرەتای سورەتەکانداو، ئەو ئایەتانەی کە تەحەدا کردنیان تێدایـەو، هـەروەها چارەنووسـی نەتـەوەکانی رابردوو: ﴿**فَكُلاًّ أَخَذْنَا بِذَنْبِهِ فَمِنْهُمْ مَنْ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِ حَاصِبًا وَمِنْهُمْ مَنْ أَخَذَتْهُ الصَّيْحَةُ وَمِنْهُمْ مَنْ خَسَفْنَا بِهِ الأَرْضَ وَمِنْهُمْ مَنْ أَغْرَقْنَا وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ وَلَكِنْ كَانُوا أَنْفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ**/ سورة العنكبوت-٤٠﴾

٦. هێنانەوەی بەڵگە گەردوونییەکان.

خەسـڵەتی ئایەتـە مەدەنییـەکانیش ئەمانەن:

١. درێژی رستەو دەربڕینەکان.

٢. دیارنــەمانی (ســجع)ی کورتــی فاسیلەکان.

٣. هێمنیو کپی مۆسقای وشەکان.

٤. ناسکی گوتارەکان.

٥. نەرم و ناسکتر کردنـەوەی وێنە ترسناکەکان ترســاندنی ســەرکوتکارانە، لەبــەر ئــەوەی روونکردنەوەو درێژی نیشاندانی فەرمان و یاساو رێسـاکان پێویسـتیان بـە سـانایی دەسـتەواژەو درێژکردنەوەی هەیە، هەروەها لەبەر ئەوەی جەدەلی عەقلی پێویستی بە هێمنی دەربڕینە، لەبەر ئەوەی گوتار لەم ئایەتانەدا بـە زۆری ئاراسـتەی کۆمـەڵی موسڵمانان دەکرایـەوە، ئـەوانیش پێویسـتیان بـە توندوتیژیو سەرکوتکردن نییە.

زانایان چەند نیشـانەیەکی دیکـەیان بـۆ ئایەتـە مـەککیو مەدەنییـەکان دانـاوە، کـە هـەندێك لـەو




نیشانانە موتلەق و براوەیەو هیچ شتێکی دیکە هەڵناگرێ، هەندێکیشیان ئەگەری زۆرینەن ساغکردنەوەو بەلایەکداخستنی ئایەتەکان بۆ مەککی یان مەدەنی دەست نیشان دەکەن.

لە نیشانە موتلەقەکان بۆ نموونە (کلا) لەهەر ئایەتێك دابێت ئەوە بێ هیچ دوو دڵییەك مەککیەو لەهیچ ئایەتێکی مەدەنیشدا نەهاتووە. بەڵکو (٣٣) جار لە (١٥) سورەتی مەککیدا هاتووە. یاخود نیشانەیەکی دیکەی رەها بەسەرهاتی نەتەوە کۆنەکانە وەك (عاد) و(ثمود) و ئیدیکە، کە لە ئایەتە مەککیەکاندا هاتوون، لەهیچ یەکێ لە ئایەتە مەدەنییەکاندا نابینرێن. هەروەها چیرۆکی حەزرەتی ئادەم و شەیتان، کە بێجگە لە سورەتی (البقرة) نەبێ کە مەدەنییە لە هەموو شوێنەکانی دیکە سورەتەکان مەککین.

**نیشانە قەتعییەکانی ئایەتە مەدەنییەکانیش گرنگترینیان ئەمانەن:**

* فەرزەکان و سنوورەکانیان و تەفسیلاتی فەرمانەکان، کە لەهیچ یەکێك لە سورەتە مەککییەکاندا ئەمە نابینین.

* باسی دووڕووەکان، هەر ئایەتێك لە مونافیقەکان بدوێ ئەوا ئەو ئایەتە مەدەنییەو، لەهیچ ئایەتێکی مەککی ئەمە بەدی ناکەین.

هەندێ لەو نیشانانەش کە زۆربەی کات سورەتەکان پێیانەوە دەناسرێنەوەو رەنگە شیمانەیەکی (احتمال) زۆر بە خۆیانەوە بگرن بۆ ئەوەی ئایەتەکەی پێ جیابکەینەوە، لەوانەش: زۆربەی گوتاری ئایەتە مەککییەکان بە (یا ایها الناس) و (یا بني آدم) هاتوون، کەچی لە ئایەتە مەدەنییەکان (یا ایها الذین امنوا) دەبیندرێت. هەروەها نیشانەیەکی دیکە سوێندە، کە زۆری لە ئایەتە مەککییەکان دەبیندرێت و کەمیش لە مەدەنییەکان. هەروەها هاتنی پیتە هیجائییەکان لەسەرەتای سورەتەکاندا بەزۆری لە ئایەتە مەککییەکاندا دەبیندرێت، بەدەگمەنیش لە ئایەتە مەدەنییەکان وەکو لە (البقرة)دا.

**سورەتەکانیش بەم شێوەیە بەسەر مەککیو مەدەنی دابەش دەکرێن:**

* زۆربەی زانایان لەسەر ئەوە کۆکن کە سورەتە مەدەنییەکان بیستن: (البقرة، ال عمران، النساء، المائدة، الانفال، التوبة، النور، الاحزاب، المجادلة، محمد، الفتح، الحجرات، الحدید، الحشر، الممتحنة، الجمعة، المنافقون، الطلاق، التحریم، النصر).

* ئەوانەش کە بۆچوونی جیاواز هەڵدەگرن (١٢) سورەتن: (الفاتحة، الرعد، الرحمن، الصف، التغابن، المطففین، القدر، البینة، الزلزلة، الاخلاص، الفلق، الناس).

* ئەوەی کە دەمێنێتەوە بەپێی بیروڕاو بۆچوونەکان مەککین، کە ژمارەیان (٨٢) سورەتە، بەم جۆرە کۆی تەواوی سورەتەکانی قورئانی پیرۆز دەبێتە(١١٤) سورەت. ئەوەی لێرەشدا گرنگەو پێویستە ئاماژەی پێبکەین ئەوەیە، هەرکاتێك هەر سورەتێك ئەگەر ناوی بەمەککی یان مەدەنی هات، ئەوا مەرج نییە تەواوی سورەتەکە مەککی یان

**جولەکەو مەسیحییەکان خاوەن زانیارییەکی زۆر بوون. بۆیە بۆ سەلماندنی هەر بابەتێك پێویستیان بەجەدەلی عەقڵی هەبوو**





مەدەنی بێت، بەڵکو ڕەنگە لە سورەتێکی مەککیدا چەند ئایەتێکی مەدەنی هەبێت یان بەپێچەوانەوە، بەلاَم ناونانەکە لەسەر بنەمای زۆرینەی ئایەتەکانە. هەروەکو لە قورئاندا دەبینین (ئەم سورەتە مەککیە تەنیا فلاَن ئایەت و فلاَن ئایەت مەدەنین).

لێرەشدا پرسیارێك دێتە پێشەوە. ئایا سوودی زانین و دیراسەکردنی زانستی مەککیو مەدەنی لە قورئانی پیرۆزو ئایەتەکاندا چییە؟ هەڵبەتە دەتوانین لەم ڕێگایەوەو لەمیانەی ڕێك وپێکی ئەم زانستەدا دەست نیشانی (ناسخ) و (المنسوخ) لە قورئانی پیرۆزدا بکەین، بۆ ئەوەی کار بە (لابەر) بکەین و (لابردراو) بخەینە دواوە، بەتایبەتی لەبواری بڕیارو یاسا ئاسمانییەکان. ئەمەش وەدی نایەت ئەگەر بەوردیو ڕێك وپێکییەوە ئاگاداری شوێن و مێژووی دابەزینی ئایەتەکان نەبین. بوونی (ناسخ)و (منسوخ) لە قورئاندا وای لە موسڵمانان کردووە دەست بە پلیکانەی حوکم و تەشریعاتەکانەوە بگرن، وەك ئەو ئایەتانەی کە پلە بەپلەو بەدوای یەکدا هاتوون لە بارەی حەرامکردنی ئارەقەوە دابەزیوون یاخود ئەوانەی سەبارەت بەسزای زیناو کاری خراپ. دەبێ ئەوەش بزانین کە مانای دانەدواوەی حوکم لە ئایەتێك ئەوە ناگەیەنێت، کە ئەم ئایەتە لە قورئان داشۆرێت، بەڵکو هەر بە قورئانی دەمێنێتەوەو دەخوێندرێتەوەو بەپیرۆزی چاوی لێ دەکرێت و هەر کەلامی خوایە، تەنیا کاری پێناکرێت بەهۆی ئەو ئایەتەی بەدوایدا دابەزیوەو ڕەتی حوکمەکەی کردۆتەوە. سوودی ئەمەش بۆ ئێمە ئەوەیە: کە بەجۆرێکی لەسەر خۆو پلە بەپلە چاو لە قۆناغەکان بکەین، کەوا یاساو بڕیارە ئاسمانییەکان بەخۆوە دەگرێت.

هەروەها ئاگاداریمان لەو ڕێبازە دروست و حەکیمانەیە هەبێت کە خوای گەورە لە ئەحکامەکان بۆمانی دارشتووە، ئیدی لەسەر قۆناغەکانی دەعوەی ئیسلامی دەوەستین و بە تەکامولی بونیادی فکریو تەسەوری ئیسلامی ئاشنا دەبین. سوودێکی دیکەی ئەم زانینەشمان کە بایەخەکەی لەوانەی پێشوو کەمتر نییە، ئەوەیە مانای ئایەتەکانمان بۆ ڕوونتر دەکات و لە هەڵەی تەفسیرو ڕاڤەکردنیش دوورمان دەخاتەوە.

**ناونانی هەر سورەتێك لەسەر بنەمای زۆرینەی ئایەتەکان لەمەککیو مەدەنی دەوەستێت**

چونکە وەختێ یەکێك سورەتی (الکافرون) دەخوێنێتەوەو ئاگاداری کاتی دابەزینی نییەو ناشزانێ سورەتەکە مەککیەو یان مەدەنی،ئەوا سەری لەماناکە دەرناچێت، چۆن موسڵمانان تەکلیفی جیهادیان لێ نەکراوە،بەڵکو ئەوەی لێیان خوازراوە کە بەخەڵکانی دیکە بڵێن: ﴿**لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ**/ سورة الكافرون-٦﴾.

بەلاَم ئەگەر بزانێ ئەم سورەتە لە مەککە دابەزیووەو، ئەمەش لەکاتێکدا بووە کە هەندێك لە بێباوەڕەکان بە پێغەمبەری خوایان (د.خ) دەگوت: (محەممەد وەرە با ڕۆژێك خوای تۆ بپەرستین و ڕۆژێکیش خوای ئێمە، کەواتە چارەسەرێکی کاتیو وەلاَمی ئەو دەمەی ئایینی پیرۆزی ئیسلامە کەپێغەمبەر (د.خ) لە مەککە بووە، ئەمەش بەڵگەی ئەوە نادات بەدەستەوە کە جیهاد ڕەوانییەو هەمیشە موسڵمانان دەستەو ئەژنۆ دانیشن. هەروەکو دواتر لە مەدینە بۆ ئەو مەبەستە ئایەتی دیکە دابەزین.

**سەرچاوە:**

القافلة، العدد الثاني عشر، اغسطس، سبتمبر، ١٩٨٦، ص٢-٥.





# حەجنامە

**مەلا تاهیر زین العابدین**

## حەج ( ٥ ) روکنی هەیە :

ئیحرام- راوەستان لە عەرەفات- تەوافی بەیت- سعی بەینی سەفاو مەروە- حلقی یان تقصیر.

## حەج ( ٥ ) واجبی هەیە :

میقات بۆ ئیحرام- رەجمی شەیتان- مبیت مزدلیفە- مبیت منا- تەوافی ئەلوداع.

## عەمرە ( ٤ ) روکنی هەیە .

هەر ئەوانەی حەجە جگە لە وەستانی عەرەفات.

## واجبەکانی عەمرە :

* میقاتە بۆ ئیحرام، خۆپاراستنە لە قەدەغەکراوەکانی ئیحرام.
* میقاتە مەکانییەکان: واتە ئەو شوێنانە کە ئیحرامیان تێدا دەبەسترێت.

- لە مەدینەوە (ذو الحليفة)یە کە بەبیری عەلی ناسراوە.
- لە شام و میسرو مەغریبەوە (جحفه)یە.
- لە نزمایییەکانی یەمەنەوە (يلملم)ە.
- لەبەرزاییەکانی یەمەن و حیجازەوە (قرن المنازل)ە.
- لەرۆژهەڵاتەوە عێراق و ئێران- (ذات عرق)ە کە لە دوای گەلی عەقیقەوەیە بۆ یەکی کە نەدات بەسەر یەکی لەو شوێنانەدا ئاستی یەکێ لەو شوێنانەیە کە ئەدات بەلایدا.

* حەج و عەمرە بەیەکەوە ئەوە (قران)ە.
* بەجیاجیا لەبەلاوە حەج ئەوە (افراد)ە.
* لە بەلاوە عەمرە ئەوە (تمتع)ە.

- ئەگەر (بەقران) ئەنجامدران کردارەکانی (طواف وسعي وحلق) بەیەکجار بوو هەردووکیان جێی دەگرێت، فدییەیەك دەدات، چونکە تێهەڵکێشی کردوون.
- ئەگەر بە ئیفراد یان بە (تمتع) ئەنجامدران هەر یەکیان کرداری (طواف وسعي وحلق)ی تایبەت بە خۆی هەیە، حاجی کە بەلاوە عەمرە بکات (متمتع) بێت ئەویش فدییەیەك دەدات.

**روکنی ( احرام ) لە یەکێ لەو شوێنانەی کە باسمان کردن بەم شێوەیە دەست پێ دەکرێت :**

١. غسل کردن.
٢. لابردنی موی لەش و قرتاندنی نینۆك.
٣. خۆ بۆن خۆش کردن.
٤. داماڵینی جل و بەرگی ئاسایی.
٥. دوو خاولی سپی لەخۆ دەپێچرێت.






٦. جووتێ نەعلی سەر پەنجەو پاژنە بەتاڵ لەپێ دەکرێت.

٧. دوورکات نوێژی سوننەتی (احرام) لەرکاتی یەکەمدا (قل یاأیها الکافرون)و لە دووەمدا (قل هو الله احد) دەخوێندرێت.

٨. هەر لەو شوێنەدا نیەتی (احرام) دەهێندرێت بە دڵ و بەزمانیش دەگوترێت.

٩. زکری (لبیك اللهم) کە شیعاری (احرام)ە گورج دەست پێ دەکرێت، بەردەوام دەبێت بەتایبەتی لەکاتی هەڵبەزو دابەزی بەرزاییو نزماییەکاندا هەتا دەگاتە رەجمی شەیتان و رۆژی جەژن درێژەی پێ دەدرێت.

**لەدوای ( احرام ) بەستنی ئەمانە قەدەغەیە لە حاجی:**

١. بەرگی ئاسایی لەبەر کردن لە کڵاو گۆرەوی‌و دەسکێشەو تا پێڵاوی پاژنەو پەنجە پۆش، بەڵام کیف و (حقیبە)و توشەبەرە هەڵ بگرێت قەیدی نییەو دەشتواندرێت پشتێنی ببەسترێ لەسەر فوتەی خوارەوە پارەو پێویستیاتی پێ هەڵگیرێت.ئەو پشتێنە قایش یان بەندو خینیش بێت قەیدی نییە، فوتەکەی سەرەوە جمکەکانی بەخۆ گرێ نادرێت و نابەسترێت، بەڵام ئافرەت هەر بە بەرگی ئاسایی خۆیەوە دەبێت و تەنها دەست و دەم و چاوی بەدەرەوە دەبێت.

٢. بۆنی خۆش لەخۆدان.

٣. سەرو ریش چەور کردن.

٤. موی لاشە لابردن و نینۆك قرتاندن.

٥. ژن و مێردی پێشەکییەکانی کە دەبنە هۆی ئارەزووشکان.

٦. ژن هێنان و شووکردن و عەقدی نیکاح بۆ خودی خۆی یان بە وەکالەت.

٧. راوکردنی نێچیری کەژی کە لە وشکایدا بژی‌و، هەر نێچیری لە حاڵەتی (احرام)دا سەر

بـبڕێت بـه مـردار بـۆی حیسـابەو گۆشـتی ناخورێت.

٨. بڕینـی درەخـت و گیـای خـاکی حـەرەم لەشاری مەککەدا.

### روکنی (طواف) ئەم واجباتانەی هەیە:

١. پـاکی لـەش و پۆشـاك و جێگـەی تـەواف لەهـەر چەپـەڵی‌و پیسـییەك و لـە بـێ دەستنوێژی‌و لەش پیسی.

٢. داپۆشینی عەورەت.

٣. لەیەکەم خاڵی (حجر الاسود)ەوە بە تەواف دەست پێ دەکرێت.

٤. لە تەوافا کەعبە دەخرێتە لای چەپەوە.

٥. خولەکان حەوت دەبن.

٦. هـەر حـەوت خولەکـە بـە دەوری هـەموو ئەجزای کەعبەدا دەبێت.

٧. لەسـەرەتای تەوافەکـەوە (قصـد)ی تـەوافی بەیت دەکرێت.

٨. لەناو تەوافەکەدا نیاز ناگۆڕێت بۆ شتی تر وەکـو تەماشـای (مطـاف)و لاو گۆشـەکانی حەرەم و دەوروبەری.

### (طواف) ئەم سوننەتانەی هەیە:

١. حاجی بەقاچی خۆی بسوڕێتەوە.

٢. بۆی بکرێت (حجر الاسود) ماچ دەکات یان دەستی لێ دەدات ئەگەر نا ئیشارەتی بۆ دەکات (ئەمە بۆ پیاو) بۆ ئافرەتان سوننەت نییە.

٣. پیاو ئەگەر بۆی بکرێـت لـەنزیکی دیـواری کەعبەوە دەخولێتەوەو بۆی بکرێ دەست دێنێ بە روکنی یەمانیداو دەستی خۆی ماچ دەکات.

٤. تـەوافی سـەعی بەدودا هـاتوو لەسـێ خـولی یەکەمدا (رمل) سوننەتە واتە پەلە پەل کردن لە رەوتاو نزیك بوونی بەینی هەنگاوەکان.

٥. لە تەوافی سێ خولەی (رمل)دا (اضطباع) سوونەتە واتە هەر دوو سەری خاولییەکی ناو شـان دەخرێتـە سـەر شـانی چـەپ و ناوەڕاستەکەی دەخرێتە ژێر قۆڵی راستەوە لە هەر ٧ خولەکەدا.

٦. خولەکان یەك لەدوای یەك دەبن.

٧. دوای تـەواف دوو رکـات نوێـژی سـونەتی تـەواف دەخوێندرێـت لەپشـت مـەقامی ئیبراهیمەوە (قل یا ایها الکـافرون) لـە رکـاتی یەکـەمداو (قـل هـو الله احـد) لـە دووهـەمدا دەخوێندرێت.

### روکنی (سعی) هاتووچۆی نێوان سەفاو مەروا ئـەم واجباتانەی هەیە:

١. دەبێ بکەوێتە دوای تەوافەوە.

٢. ژمارەی هاتووچۆی حەوت جار دەبن.

٣. لەبـەرزی سـەفاوە دەسـت پـێ دەکرێـت لەبـەرزی مـەروەوە کۆتـایی بـە حەوتەمینەکـە دێت.

### (سعی) ئەم سوننەتانەی هەیە:

١. بەدەسـت نوێـژو عـەورەتی داپۆشـراوەوە دەکرێت.

٢. تونـد دەبێـت لـەنێوان هـەردوو میلـە سەوزەکاندا.

٣. هاتووچۆکە بەشوێن یەکدا بن.

٤. ئەگەر گونجا مەیدانەکە چۆڵ بێت.

٥. ئـەو زکـرو دوعایانـە کـە (مـأثورن) زۆریـان بکـات و بڵێـت: (رب اغفـر وارحـم وتجـاوز عما تعلـم انك انت الاعـز الاکـرام اللهم اتنـا في الدنیا حسـنة وفي الاخـرة حسـنة وقنـا عـذاب النار).




**واجبەکانی روکنی وەستانی عەرەفات دوو شتە:**

١. لە دوای نیوەڕۆی (٩)ی مانگەوە دەبێت تا بەیانی ڕۆژی جەژن.

٢. حاجی لە عەرەفاتدا دەبێ بێ هۆش و خەوتوو و سەرخۆش نەبێت عیبادەتی دروست بێت.

**چوونی عەرەفات**

١. ڕۆژی ٨ی مانگ سەر لە بەیانییەکەی بەرێ دەکەون بۆ خاکی مینا.

٢. نوێژەکانی نیوەڕۆو عەسرو مەغریب و عیشا لەخاکی مینادا دەکرێت.

٣. شەوی ٩ی مانگ لە مینا (باشترە) دەمێننەوە بە زکری لبیك ودوعاو نزاوە.

٤. نوێژی بەیانی لە مینا دەکرێت، کە ڕۆژ دایەوە دەکەونە ڕێ بۆ عەرەفات.

٥. گەیشتنە (نمرە) چاوەنواری دەکرێت تا نوێژی نیوەڕۆ دەبێت نیوەڕۆو عەسر بە قصرو جمع دەکەن بە مەرجێ (٤) ڕۆژ لە مەککە ئیقامەیان نەبووبێت (جگە لە ڕۆژی داخل بوون و ئەو ڕۆژەی کە لەوێن).

٦. دوای ئەدای نوێژ دەچن بۆ عەرەفات (سوننەتە پیاو بە پێوە ڕاوەستێ و ئافرەت دانیشێ) ئەگەر دەست بدات و ئازاریان نەبێت و ئازاریان نەبێت و ئازاری خەڵك نەدرێت بگەنە بەردە پانەکانی داوێنی (جبل الرحمة).

**عەرەفات ئەم سوننەتانەی هەیە:**

١. گەیشتە نەمرە غسل دەکرێت.

٢. گوێ دانە وتارو ڕوونکردنەوەی ئادابی حەج و عەرەفات.

٣. (جمع والتقديم) بۆ نوێژی عەسری لەگەڵ نوێژی نیوەڕۆ ئەو ڕۆژە بەمەرجێ (٤) ڕۆژ لە مەککە ئیقامەی نەکرد بێت.

٤. پەلەکردن لە دوای نوێژەکان بۆ داخیل بوونی عەرەفات.

٥. هەوڵدان بۆ گەیشتن بەو جێگایە کە حەزرەت ڕاوەستاوە تێدا بەبێ ئازاردانی خەڵك.

٦. بەپیادەیی لە عەرەفات بمێننەوە.

٧. ڕاوەستان بۆ پیاو دانیشتن بۆ ئافرەت ڕوو بە قیبلە.

٨. بەڕۆژوونەبوونی ئەو ڕۆژە (چونکە بۆ حاجی سونەت نییە نۆمینە بەڕۆژووبێت).

٩. ئاگای لە دڵی خۆی بێت و چاوەڕوانی ڕەحمەتی خوا بێت.

١٠. تەهلیلەو دوعاو قورئان خوێندنی زۆر بێ وچان.

١١. نەچوونە سێبەر هەتا دەتواندرێت.

١٢. ڕۆژ بداتە دەمی شەو واتا پاش ئاوابوونی خۆر لە عەرەفات شۆر ببێتەوە بۆ مزدلفە.

١٣. خێرو سەدەقەی زۆر لەو ڕۆژەدا.

١٤. خۆ پاراستن لە ڕەفتارو گوفتاری بێ سوود.

**هاتنەوە لە عەرەفاتەوە بەرەو مزدلفە کە (مبیت تێدا واجبێکی حەجە)**

١. مەغریب داهات لە عەرەفاتەوە دادەبەزن بۆ مزدلیفە نوێژی مەغریب دەبرێتە پاڵ نوێژی عیشاو (جمع)ی دەکەن (ئەگەر نوێژی مەغریب لە عەرەفات بکرێت و عیشاش لە مزدلیفە هەر چاکە).

٢. غسل لە مزدلیفە ئەگەر گونجا.





٣. زكـرى لبيـك و دوعـاى (مـاثور) بـەردەوام دەبن.

٤. تا نيوەى دووەمى شەو لە مزدليفە دەبن.

٥. حـەوت بـەردى رەمـى شـەيتان لـە مزدليفـە هـەلدەگيريت و دەشـتوانن هـەموو بـەردەكانى رەمـى هـەر سـێ رۆژەكـەى دواى جـەژن هـەلگرن كە دەكاتە (٧٠) بەرد.

٦. دەچنـە (مشـعر الحـرام) خـەريكى زيكـرو تاعەت دەبن تا نوێژى بەيانى دەكريت.

٧. دواى نوێژى بەيانى روو لە مينا دەكريت بۆ ئەنجامى واجبێكى ترى حەج كە ئەويش رەمى شەيتانى گەورەيە واتە (جمرة العقبة).

**رەمى شەيتان ئەم واجباتەى هەيە:**

١. ئەوەى فـرێ دەدريـت دەبـێ بـەرد بـێ هـەر نەوعێك بێت.

٢. بەحـەوت جـار فـرێ بدرێـن نـەكو دوو يـان زياتر.

٣. بـەعورف دەبـێ بـەفرێدانى دابنێـن نـەكو بخرێتە ناو كۆگاكەوە بەدەست.

٤. دەبـێ قەسـدى ئـەو كۆگايـە بكريـت و بـۆ كۆگاكە بگيريت.

٥. دەبـێ ئـەو بـەردە بكەوێتـە نـاو ئـەو كۆگايـە ئەگـەر كەوتـە نـاوى‌و پاشـان بازرەقـەى بەسـت قەيدى نييە.

**سوننەتە كانى رەمى:**

١. بەگەيشتنى مينا بەر لە هەر كارێك رەجمى شەيتان دەكريت.

٢. رۆژ بەقەدەر رمێ بەرز بێتەوە ئينجا رەمى بكريت.

٣. لەرەميدا شارى مەككە بكەوێتە لاى چەپەوە مينا لاى راستەوە روو لە عەقەبە بكريت.

٤. پياو ئەوەندە دەستى بەرزبكاتـەوە بن بالى دەربكەوێت.

٥. كە دەستكرا بە رەمى واز لـە زيكـرى لبيـك دەهێندريت لەگەل هـەر بـەردێكدا دەگوتريـت: (الله اكبر).

٦. بەسوارى رەمى بكريت (بەلام دەست نادات لەم زەمانەدا).

٧. بەردەكە ئەوەندەى بەردى بەلە پيتكە بێت نە زيادو نەكەم.

٨. لـەرەمى دەسـت هـەلگيرا كـاتى حـەيوان سەربرينەوە (ئەگەر هەيبوو).

٩. دواى (ذبح) پياو سـەرى دەتاشـێ‌و ئـافرەت چەند تەلەموويك لەسـەرى ئـەقاچێ (روكنێكـى ترى حەجە).

١٠. دواى سەرتاشين دەگەرێتـەوە بۆ مەككە بـۆ تەوافى روكن (طواف الافاضة).

١١. دواى تەواف سەعى سەفاو مەروا دەكريت.

١٢. بـۆ شـەو دەگەرێتـەوە بـۆ مينـا، چونكـە (مانەوە لە مينا واجبێكى حەجە).

١٣. رۆژەكانى (١٣،١٢،١١)دواى نيوەرۆ هەر (٣) شەيتان رەجم دەكريت هەر يەكێكيان بە حەوت بەردو شەوەكانيان لە مينا دەبن.

١٤. ئەگەر بيانەوێ دواى رەجمى شەيتان رۆژى (١٢)ى مانگ دەرچن ئـەوا بـە مـەيلى خۆيانـە، بەلام دەبـێ شـەوى بەسـەردا نەيـەت لـە مينـا دەرچێت، ئەگەر كەوتە شەو دەبێ رەمى رۆژى ١٣ش بكات.

١٥. كـە ويسـتى بگەرێتـەوە بـۆ ولاتـى خـۆى (طـواف الـوداع) دەكات (كـە ئـەويش واجبێكـى ترى حەجە) دوو ركات نوێژ لـە پشتى مـەقامى ئيبراهيمـەوە، جـا نـاوى خـواى لێ دەمێنـن و دەردەچێت بۆ گەرانەوە.





# حەج کردن لەئیسلامدا

**مەلا رەشید گەردی**

حەج کردن واجبەو روکنی پێنجەمی ئایینی ئیسلامە لە ساڵی شەشەمی کۆچیدا واجب کراوە. حەج لە زمانی عەرەبیدابە مانای دیدەنی کردنی شتی گەورەو مەزنە. لە شەرعی ئیسلامدا بەمانای دیدەنی کردنی ماڵی خودایە کە کەعبەی پیرۆزو موبارەکە لەشاری مەککە بەنیازی خودا پەرستی. حەجیش یەکێکە لەو کارە ئایینیانەی کە پێش ئیسلام ئەنجامدراوە لەکۆن زەمانەوە لای هەموو گەل و میللەت و خاوەن ئایینێك هەبووە. هەر نەتەوەو گەلێك بەجۆرێك و شێوازێك کردارو رەفتاری حەجی خۆی ئەنجامداوە. عەرەبەکانیش پێش هاتنی ئیسلام حەجی کەعبەیان کردووە بۆ ئەو خانوو بەیتەی کە حەزرەتی ئیبراهیم و ئیسماعیلی کوڕی لە مەککە دروستیان کردبوو. ئینجا کە ئایینی ئیسلام هات حەجی واجب کرد. بەڵام نەیهێشت هەندێك لە کردارو گوفتارەکانی لەسەر شێوازی سەردەمی نەزانیو جاهیلی ئەنجام بدرێ، چونکە برێك لە عەرەبەکان کە دەچوون بۆ حەج بە لەشی رووت و قووت بەدەوری کەعبەدا دەسووڕانەوە. دەستیان دەخستە ناو دەستی یەکترەوەو فیتەو فیکەیان لێدەداو هەندێك جاریش دەیان کردە قیژە قیژو فیکەکردن و چەپڵە لێدان. ئەوەتە قورئانی پیرۆز لەشێوەی دەربڕینی ناڕەزایی بەو کارە ناڕێکەیان دەفەرمووێ: ﴿**وَمَا كَانَ صَلاَتُهُمْ عِنْدَ الْبَيْتِ إِلاَّ مُكَاءً وَتَصْدِيَةً** سورة الانفال-٣٥﴾ واتە: ئەوە نوێژ نەبوو کە ئەوان لەماڵی خودا دەیانکرد. کە بریتی بوو لە قیژە قیژو فیکەکردن و چەپڵە لێدان و بەس. سەرەتای پەیدابوونی ئیسلامیش کە موسڵمانەکان لەگەڵ پێغەمبەری مەزندا (د.خ) دەچوون بۆ کەعبە بۆ نوێژکردن ئەوان زیاتر فیقەو قیژاندن و هەراو هۆریایان لەناو مەسجیدولحەرامدا دەکرد هەتا پێغەمبەری خواو یارانی نەتوانن بەرێك و پێکی نوێژی خۆیان بکەن تاکو گوێیان لەیەکتری نەبێ‌و نەزانن چیان گوتووە. کاتێکیش موسڵمانەکان بەهێزبوون و لە مەدینەی پیرۆز لەشکریان هێنایە سەر کافرەکان و فەتحی مەککەیان کردو کەعبەی پیرۆزیان کۆنترۆڵ کرد بە تەواوی کەعبەیان لە دیاردەی بت پەرستیو نەزانی پاککردەوە. چۆنیەتی دروستکردنی کەعبەش دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی حەزرەتی ئیبراهیم (خوای لێ رازی بێت) لەو رۆژگارەدا بت پەرستی بەتەواوی بڵاو ببۆوە. خەڵك وازی لە خودا پەرستی هێنابوو روویان کردبووە بت پەرستی. ئیتر حەزرەتی ئیبراهیم (خوای لێ رازی بێت) نیشتمان و وڵاتی خۆی بەجێهێشت و رووی کردە وڵاتی حیجازو شوێنی شاری مەککەی ئێستا کە ئەوکاتە چۆڵەوانی بوو، بارو بارگەی خۆی لەوێ خست بۆ ئەوەی لەوێ خێزانێکی خودا پەرست پێکەوە بنێ. جا کاتێك حەزرەتی ئیسماعیلی کوڕی پێگەیشت و هێزو توانای پەیداکرد خوای گەورە فەرمانی بە حەزرەتی ئیبراهیم(خوای لێ رازی بێت) کرد، کە





مزگەوتێك دروست بكات بۆ ئەوەی خەڵك بۆ خوا پەرستی تێیدا كۆببنەوە. یادو سوپاس و ستایشی خودای تێدا ئەنجامبدەن، قورئانی پیرۆزیش بەروونی ئاماژەی بۆ ئەم رووداوە كردووە، كە دەفەرموێت: ﴿وَإِذْ يَرْفَعُ إِبْرَاهِيمُ الْقَوَاعِدَ مِنَ الْبَيْتِ وَإِسْمَاعِيلُ رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّا إِنَّكَ أَنْتَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ/ سورة البقرة-١٢٧﴾ جا لە پاش ئەوەی كە حەزرەتی ئیبراهیم و ئیسماعیل شێوەو شێوازی كەعبەیان تەواوكرد. خوای گەورە فەرمانی پێكردن كە لە هەموو پیسیەكی مادیو مەعنەوی بپارێزن و بەپاك و خاوێنی رایبگرن و بیكەنە جێگاو شوێنی یەكتاپەرستیو خواپەرستی، وەك خوا دەفەرمووێ: ﴿وَعَهِدْنَا إِلَى إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ أَنْ طَهِّرَا بَيْتِيَ لِلطَّائِفِينَ وَالْعَاكِفِينَ وَالرُّكَّعِ السُّجُودِ/ سورة البقرة-١٢٥﴾ واتە: فەرمانماندا بە حەزرەتی ئیبراهیم و ئیسماعیلی كوری كە ئەم كەعبەماڵی منە دەرو ناوی پاكبكەنەوە لەهەر شتێك كە نەگونجێ لەگەڵ خواپەرستیو موناجاتی خوای گەورەدا بۆ ئەو كەسانەی كە بەشێوەی ئایین هەڵدەسووڕێن بەدەوریدا یان لەناویدا دەمێننەوە بۆ بەندایەتی خودا یان نوێژی تێدا دەكەن و خوا پەرستی تێدادەكەن. كەواتە كەعبەی پیرۆز یەكەم خانوویێكە كە بۆ خواپەرستی دروستكراوە، وەك خوا دەفەرمووێ: ﴿إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِي بِبَكَّةَ مُبَارَكًا وَهُدًى لِلْعَالَمِينَ* فِيهِ آيَاتٌ بَيِّنَاتٌ مَقَامُ إِبْرَاهِيمَ وَمَنْ دَخَلَهُ كَانَ آمِنًا/ سورة ال عمران-٩٦-٩٧﴾ واتە: لە راستیدا یەكەم بەیت كە داندرابێت لەسەر زەوی بۆ خواپەرستی. ئەو بەیتەیە كەوا لەشاری مەككەیە كە ماڵێكی خاوەن پیت و بەرەكەت و هۆی شارەزابوون و هیدایەتە بۆ هەموو كەسێك. چەند بەڵگەو نیشانەیەكی گەورەی ئاشكرای تێدایە وەك مەقامی ئیبراهیم و حەجەرولئەسوەد. هەر كەسێك بچێتە ناوی لە جەهەنەم رزگاری دەبیو لەدونیاشدا ئاسوودەو ئارام دەبێ. جا كە حەزرەتی ئیبراهیم لە دونیا دەرچوو وەفاتی كرد. حەزرەتی ئیسماعیل پاش ئەو لەسەر داب و نەریتی باوكیو بەگوێرەی فەرمانی خوای گەورە ئەم بەیتە پیرۆزەی پاراست و





بێجگە لەخوا پەرستی ڕێگەی نەدا هیچ شتێکی دیکەی تێدا ئەنجام بدرێ. ساڵانە خەڵکێکی زۆر دەهاتن بۆ حەجی ماڵی خودا بەرێك و پێکی ئەرکەکانی حەجیان ئەنجامدەدا، بەڵام کە ڕۆژگار درێژەی کێشاو سەردەمی ئەو دوو پێغەمبەرە گەورەیە زۆری بەسەردا تێپەڕی. خەڵکیش زۆر شتی ناڕێکیان تێکەڵ بەکارو کرداری حەج کرد. شەریك بۆ خودا قەراردان و بت پەرستیان دەست پێکرد. بۆیە خوای گەورە حەزرەتی محەممەدەلمستەفای کردە پێغەمبەرو ناردی بۆ نەهێشتنی کوفرو بت پەرستیو گێڕانەوەی خەڵکی بۆ یەکتا پەرستیو خوا بەحەق زانین و خودا پەرستییەك کە حەزرەتی ئیبراهیم (ڕەزای خوای لێ بێت) لەسەردەمی خۆیدا ئەنجامی دابوو و پەیڕەوی کردبوو. وەك خوا دەفەرموێت: ﴿هُوَ اجْتَبَاكُمْ وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ مِلَّةَ أَبِيكُمْ إِبْرَاهِيمَ هُوَ سَمَّاكُمُ الْمُسْلِمِينَ مِنْ قَبْلُ / سورة الحج-٧٨﴾ واتە: ئەی ئوممەتی محەممەد (د.خ) خوای گەورە بەزاتی خۆی ئێوەی هەڵبژاردووە بۆ ئەوەی ببنە کۆمەڵی موسڵمان و هەڵگری ئاڵای ئیسلام ئەوەش بزانن کە خوای گەورە لە ئەرك و ئەنجامدانی پێویستییە ئایینیەکانی سەر شانتان هیچ شتێکی لەتاقەت بەدەری خۆتانی لێداوا نەکردوون. ئایینی بۆ ئاسانکردوون وەکو چۆن بۆ باوکی پێغەمبەران حەزرەتی ئیبراهیمی (خوا لێی ڕازی بێت) ئاسان کردبوو، خودا بەزاتی خۆی ئێوەی ناولێناوە موسڵمان لە کتێبە ئاسمانییەکانی پێشوودا ئێوەی بە موسڵمان ناوبردووە. یان مەبەستی ئەوەیە کە حەزرەتی ئیبراهیم (خوا لێی ڕازی بێت) کاتی خۆی ئێوەی ناولێناوە موسڵمان و کە لە خوای گەورە پاڕایتەوە فەرموویەتی: ﴿وَمِنْ ذُرِّيَّتِنَا أُمَّةً مُسْلِمَةً

## کەعبە یەکەم ماڵی خوایە بۆ پەرستن دروست کرا بێت

لَكَ/ سورة البقرة-١٢٨﴾ ئەمەش مانای ئەوەیە کە حەزرەتی ئیبراهیم دوعای کردووەو ناوی ئێمەی کردووە بەموسڵمان. ئینجا با بزانین جەوهەری حەج لە ئایینی ئیسلامدا وەکو قورئان و سونەتی پێغەمبەر (د.خ) چۆنە، حەج لە ئایینی ئیسلامدا زۆر جیاوازی هەیە لەو حەجەی کە لە ئایینەکانی دیکەدا هەیە. ئەوەتا لە ئایینەکانی دیکەدا حەج بریتییە لە ماچ کردن و لە ئامێز گرتن و خۆ لە خۆڵ و تۆز تێهەڵسوین کە ئەم دیاردە گەلێك ناپەسندە لە ئیسلامداو بەرەوای نازانێت. چاکترین حەج لەلای ئایینەکانی دیکە ئەوەیە کە ئینسان خۆی بهاوێتە ناڕەحەتییەوە لە ڕێگای حەجدا خۆی ماندووبکات. بەڵام لە ئایینی ئیسلامدا ئەم دیاردەیە ناپەسندەو نایەوێ ئینسان بامەبەستیشی زێدە پاداشتیش بێ خۆی بهاوێتە ناڕەحەتییەوە. ئەوەتا لە فەرموودە بۆمان ڕیوایەت دەکا (کە جارێك پێغەمبەری ڕەحمەت و بەرەکەت(د.خ) پیاوێکی پیری دیت قوربانییەکی پێبوو دوو کوڕی خۆشی چوبوونە ژێر باڵیەوە بەرەو مەککەی پیرۆز دەڕۆیشتن بۆ حەجکردن، پێغەمبەری خواش(د.خ) پرسیاری لەحاڵ و چۆنیەتی لە کابرای پیرەمێرد کرد. عەرزیان کرد یارەسوڵڵا ئەو پیرەمێردە لەسەرەخۆی نەزر کردووە کە بەپێیان حەج بکاو سواری وڵاغ نەبێ. پێغەمبەریش(د.خ) فەرمووی: بەو پیرەمێردە بڵێن با وانەکات. چونکە خوای گەورە پێویستی بەوە نییە کە ئەم کابرایە ئەزیەت و ئازاری لاشەو جەستەی خۆی بدات. بڕۆن سواری حوشترێکی




بکەن یا بەسواری حوشتر ڕێگایەکە ببڕیٚ! بەڵێ لە ئاینی ئیسلامیدا حەج وەسیلەو هۆیە بۆ بەدەستهێنانی بەهرەی رووحیو گیانیو رەوشتیو رۆشنبیریو کۆمەلایەتیو ئابووری. ئەوەتا ئەم ئایەتە پیرۆزە بە ئاشکرا ئاماژە بۆ ئەوە دەکات و دەفەرمووێ: ﴿وَأَذِّنْ فِي النَّاسِ بِالْحَجِّ يَأْتُوكَ رِجَالاً وَعَلَى كُلِّ ضَامِرٍ يَأْتِينَ مِنْ كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٍ* لِيَشْهَدُوا مَنَافِعَ لَهُمْ وَيَذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ فِي أَيَّامٍ مَعْلُومَاتٍ عَلَى مَا رَزَقَهُمْ مِنْ بَهِيمَةِ الأَنْعَامِ فَكُلُوا مِنْهَا وَأَطْعِمُوا الْبَائِسَ الْفَقِيرَ/ سورة الحج-٢٧-٢٨﴾ واتە: ئەی ئیبراهیم (رەزای خوای لێ بێت) بە خەڵك رابگەیەنەکە حەجی کەعبە بکەن بانگیان بکە بۆ حەج کردن و پێیان بڵێ: حەج کردن فەرمانی خودایەو ئەنجامی بدەن. ئیتر ساڵانە لە هەموو لایەکی دونیاوە خواناسان بە پیادەو بە سواری دێن بۆ زیارەتی ماڵی خوا. با ئامادەیی رێو رەسمی بەجێهێنانی حەج ببن و سوود لەم لـەهُمْ﴾ بدەین دەبینین زانایانی ئیسلام وایان لێکداوەتەوە کە مەبەست لە سوود سوودی دونیاو قیامەتە. هەم لایەنی ئاینیو هەم لایەنی دونیایش دەگرێتەوە، چونکە لە روانگەی قورئانەوە دین و دونیا وەکو گیان و لاشە تەواوکەری یەکترن و پەیوەندی بەهێزیان لەنێواندا هەیە. هیچیان بێ ئەوی دیکەیان نابێ، چونکە ئەگەر ئاین هێزی باوەڕ بدات بەگیان ئەوە کارە دونیاییەکانیش هۆیەکانی مانەوەو پێشکەوتن بەگیان دەبەخشن و دەبنە هۆی راگری ئەو جەستەیەی کە ئەو گیانەی هەڵگرتووە. ئەگەر بشمانەوێ لەهەموو رووییێکەوە سەرژمێری بەروبوومەکانی حەج بکەین، لێرەدا جێی نابێتەوە. بەهەر حاڵ حەج کۆبوونەوەیەکی گشتیو فیستڤاڵی سەرتاسەری موسڵمانانە بۆ یەکخستنی مەبەستە جۆراو جۆرەکانی خۆیان و رێنمایی کردنی هەر یەك لەوان بۆ دۆزینەوەی سەرچاوەی پاك و خاوێن و شت لەیەکتری فێربوون و یەکتر ناسینی ناوخۆیان و بەهێزکردنی پەیوەندییە ستراتیجییەکانیان. جگە لەوەش لایەنێکی دیکەی گرنگ هەیە ئەویش لایەنی ئابوورییە، چونکە هەموو گەلێك لەو گەلە موسڵمانانە

## حەج یەکێکە لەو کارە ئاینیانەی
## کە بەر لە ئیسلام و لای هەموو میللەت و خاوەن
## ئاینێك دەبیندرێت

پیشەسازی تایبەتی خۆیان هەیە، بەرو بوومی تایبەتی خۆیان هەیە لەلای گەلێکی دیکە دەست ناکەوێ. جا بەهۆی ئەو کۆبوونەوە گشتییەوە دەتوانرێ سەوداو گۆڕینەوەی ئەو شتانە ئەنجام بدرێ ئامادەبوونی خاوەنی ئەو کەل و پەل و پیشەسازیانە لە کۆبوونەوەیەکی ئەوهادا زۆر لەو کۆسپ و تەگەرانە رادەماڵێ، کە لەوانەیە ببنە بەرهەڵست و تەنگ و چەڵەمە بۆ ئەنجامدانی ئەو کۆبوونەوە جیهانییە وەربگرن لەو رۆژە دیاریکراوانەدا یادی خودا بکەن. کە رۆژیو ئەو هەموو نیعمەتەی پێتان داوە. ئەو ئاژەڵانەی وەکو نیعمەت بۆ لەبەر دەستی داناون کە بە ئارەزووی خۆتان دەیانکەنە کوشتیو سەریان دەبڕن. دەی ئێوە لە گۆشتی ئەو کوشتیانەی خۆتان بخۆن و بەشیو نەدارو هەژارانیشی لێبدەن. ئینجا دەبا ئێمە سەرنجێکی ورد لە رستەی: ﴿لِيَشْهَدُوا مَنَافِعَ




جۆره سەودایانە. بەراستیش حەج کردن له ئایینی ئیسلامدا زۆر گەورەو مەزنــه ئــەو کەسانەی کــه بەرێك و پێکی ئەم حەجه ئەنجامدەدەن پاداشتێکی زۆر گــەوره بەدەســت دێنــن. ئــەوەتا پێغەمبــەری خوا(د.خ) دەفەرمووێ: (**من حج لله فلم يرفث ولم يفسق رجع كيوم ولدته امه**)-رواه الخمسة- واتە: هەر کەسێك بۆ خــودا حــەج بکــاو لــەکاتی کردنــی حەجەکــەدا لەگــەڵ ئــافرەتی خــۆی جــووت نــەبێو گفتوگۆی ناڕێك نــەکا، ئــەوه وەکــو ئــەو رۆژەیــه کــه لــەدایك دەبــێ ئــاوا لــه گوناهــان پــاك دەبێتــەوه. هەروەها حــەج کردن هۆی چوونه بەهەشته ئەگــەر بەرێك و پێکی ئەنجام درا. ئەوەتە پێغەمبەری خوا (د.خ) دەفەرمووێ: (**تــابعوا بــين الحــج والعمــرة فانهما ينفيان الفقــر والذنــوب كمــا ينفــي الكــير خبث الحديــد والذهب والفضــة. وليــس للحجــة المبرورة ثواب الا الجنة**) (رواه النسائي والترمذي) واتە: حەج و عومره بەدوای یەکتر بکــەن و بەینیان مەدەنێ، چونکه ئەم دوانه هەژاریو تاوان ناهێڵن و دەیهاڕن هەر وەك چۆن مووشه چڵك و ئاسن و زیو پاك دەکاتــەوه ئاوایــه. حــەجی بــاش و دروســتیش لەلای خوای گەوره پاداشتی تەنها بەهەشتە. ئینجا با بزانین حەج کردن لەســەر کێ واجبــەو پێویستە. هەڵبەتە حــەج لەســەر هــەموو موســڵمانێکی ژێــری پێگەیشــتوو بــالغی لــەش ســاغ واجبــەو پێویســتە لــەماوەی ژیانیشــدا یــەك حــەج فــەرزە، بەمــەرجێ توانــاو ئیمکانیــەتی ســەفەرو کرێــی گواســتنەوەی رێگای هەبێو ئەوەندەشی ماڵ و دارایی هەبێ ماڵ و منداڵی لــەماوەی سەفەرەکەیدا بــه تــێرو تەســەلی پێــی بژیــن، ئــەو مــاڵ و داراییــەش دەبــێ ســاغ هــی خــۆی بــێو مــافی کەســێکی دیکــەی پێــوه نــەبێ، قــەرزی خــەڵکی تێــدا نــەبێو ســوودو ریبــای تێــدا نەبێو زەکاتیشی لێدرابێ. سەرەڕای ئەوەش دەبێ رێگای مەککــه لــه چــــــوون و هاتنــــەوەدا بــــێ ئــەمین و ئــەمان و تــرس و لــەرزی تێدا نەبێو ئەرکان و پایــــــەکانی حــــەجیش ئــــەم شتانەن:

١. ئیحــــــــرام دابەســـــتن لــــه میقاتــەوه کــه بــه (لبيك اللهم لبيك) بــــەدەنگی بــــەرز دەســـت پێدەکـــاو بـــەرگی ئیحـــرام دەپۆشێ.
٢. هەڵســــــوڕان بــــەدەوری مــــاڵی کەعبەدا.
٣. هــــــاتووچۆی نێوان سەفاو مەروه.
٤. راوەستانی کێوی عەرەفە.
٥. تاشینی یان کورت کردنەوەی مووی سەر.
٦. ریزکردنـــی ئـــەم کردارانــه بـــەپێی ئـــەم رێزکردنەیان.

**حەج له ئایینیەکانی دیکه ئەوەیه مرۆڤ خۆی بهاوێته ناڕەحەتییەوه کەچی ئیسلام ئەوەی قبول نییه**








﴿إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِي بِبَكَّةَ مُبَارَكًا وَهُدًى لِلْعَالَمِينَ/ سورة ال عمران-٩٦﴾.

بێگومان ئەو خانووەی کە رووگەی موسڵمانانە لە نوێژو پاڕانەوەدا ئەوە یەکەم خانوویێکە بۆ خواپەرستی دروستکراوە. ئەو خانووەیە کە ئیبراهیم و ئیسماعیل دروستیان کرد بۆ خودا پەرستی وەکو دەفەرموویێت: ﴿وَإِذْ يَرْفَعُ إِبْرَاهِيمُ الْقَوَاعِدَ مِنَ الْبَيْتِ وَإِسْمَاعِيلُ/ سورة البقرة-١٢٧﴾ ئەمجا پاش ئەم مێژووە بەچەند چەرخێك ساڵی (١٠٠٥)ی پێش زایین حەزرەتی سلێمانی کوڕی داود (سەلامی خوایان لێ بێت) مزگەوتی قودسی دروستکردووە. ئیبراهیم کە کەعبەی دروستکرد کردی بەیەکەم رووگەی خودا پەرستی، کەوابێ پێغەمبەری ئیسلام لەسەر ئایینی ئیبراهیمە کە ئەویش لەکاتی نوێژو خودا پەرستی رووی دەکردە کەعبە.

بەکورتی: یەکەم پەرستگایەکی راست و دروست کە پێغەمبەران دروستیان کردبێ کەعبەی پیرۆزەو لەسەر زەوی پێش کەعبە پەرستگایەکی تر دروست نەکراوە. دێر زەمانیش دەبێتە مایەی زۆر ڕێزی.



ئەم خانووە پیرۆزە چەند تایبەتمەندییەکی هەیە:

١. پیرۆزو خێرو بەرەکەت ئامێزە ئەم شارە پیرۆزە، هەرچەندە لە دۆڵێکی رەقەن و رووتەن دایە، میوەو بەروبوومی هەموو شتێکی لەهەموو لایەکەوە بۆ دێ وەکو خودا دەفەرمووێ: ﴿يُجْبَى إِلَيْهِ ثَمَرَاتُ كُلِّ شَيْءٍ/ سورة القصص-٥٧ ﴾ زیاد لەوە خێرو بەرەکەتی چاکەشی هەیە خێرو خێرات تێیدا پاداشتی چەند بارە دەدرێتەوەو دوعاو نزاو پاڕانەوە تێیدا گیرا دەبێ.

٢.﴿ وَهُدًى لِلْعَالَمِينَ﴾ ئەو ئاستانە سەرچاوەی شارەزایی کردنی خەڵکە نوێژ کەرەکان لەکاتی نوێژو پاڕانەوەدا رووی تێدەکەن و، دڵی موسڵمانان پێوە بەندە، ساڵانە بەسواریو بەپیادە ملیۆنەها خەڵکی بۆ دەکشێن و دەچن بۆ دیدەنی ئەم ماڵە پیرۆزە لەهەموو لایەکەوە موسڵمانان دەڕژێنە ئەو (حەرەمە) و، بۆ ئەنجامدانی ئەرکەکانی حەج و عەمرە، ئەمەش بەبەرەکەتی نزاو پاڕانەوەی ئیبراهیم (خوای لێ رازی بێت) لە پەروەردگار پاڕایەوە گوتی: ﴿رَبَّنَا إِنِّي أَسْكَنتُ مِنْ ذُرِّيَّتِي بِوَادٍ غَيْرِ ذِي زَرْعٍ عِنْدَ بَيْتِكَ الْمُحَرَّمِ رَبَّنَا لِيُقِيمُوا الصَّلَاةَ فَاجْعَلْ أَفْئِدَةً مِنَ النَّاسِ تَهْوِي إِلَيْهِمْ وَارْزُقْهُمْ مِنَ الثَّمَرَاتِ لَعَلَّهُمْ يَشْكُرُونَ/ سورة ابراهيم-٣٧﴾.




# حەج و تەندروستی دەروونی

زەیتۆ شێخانی

حـــەج روکنـــی پێنجــــەمی ئیسلامەو فەرمانێکی خواییە کە دەفەرمووێت: ﴿وَلِلَّهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ مَنْ اسْـتَطَاعَ إِلَيْـهِ سَـبِيلاً﴾ ال عمـران-٩٧ واتـە لەسەر خەڵك پێویستە حەج بکەن بۆ خـوا، ئـەو کەسـەی توانـای هەیـە. حــەج سیســتەمێکی روحــیو خواپەرســتییە لـــە ئیسلام. ئەگـەرچی ئـەنجامدانی ئـەم روکنــە جێبــەجێ کردنــی فـەرمانی خوایـەو نوێکردنـەوەی بەندایەتییــە بــۆ پــەروەردگار، لەهەمان کـاتدا سـوودێکی زۆری جەســـتەییو کۆمەڵایـــەتیو تەندروســتی بــەخودی مــرۆڤ دەگەیەنێت. بۆیە ئێمەش لێرەدا هـــــەندێك لــەم ســـوودانە لـــەرووی دەروونییـــەوە روون دەکەینەوە.

هـەر تـاکێکی موسـڵمان کـە نیەتی حەج دەهێنێت و خۆی بۆ ئامادە دەکات لەگەڵ هەستکردن بەبەختیاری هەسـت بـەترس و دڵـەڕاوکێش دەکـات، بـەڵام ئـەم تـــرس و دڵەڕاوکێیـــە بـــۆ ســــەرکەوتنی هـــەر کـــارێك بەئاساییو پێویست دادەنرێت.

موسڵمان کـە خـۆی بـۆ ئـەم سـەفەرە ئامـادە دەکـات پرسـیار لـەخۆی دەکـات، دەڵێـت: ئایـا دەتوانم پێداویستییەکانی حـەج بەشێوەیەکی رێك و پێك ئـەنجام بــدەم؟ چونکـــە ئـــەنجامدانی مەنســــەکەکان پێویســــتی بـــەماندووبوونێکی زۆر هەیـــە، وەك: (تـــەواف، ســـەفاومەروا، وەستان لە کێوی عەرەفە، رەجم کردنـی شـەیتان هتـد) بۆیـە لـە رووی دەروونییـــەوە خـــۆی بـــۆ ئامـــادە دەکـــات، ئەمـــەش وای لێدەکـات هەسـت بکـات توانـای هەیە روو بەڕووی داواکانی ژیان ببێتـــەوە، چونکـــە ئـــەنجامدانی مەنسەکەکانی حـەج بـۆ موسـڵمان بۆتـە داوایـەکی ژیـان، پێویسـتە روو بـــەڕووی ببێتـــەوە. ئـــەم سیفەتە لە هـەر مرۆڤێك بێتـەدی ئـەم مرۆڤـە تـێڕوانینێکی سـاغ و بابەتی بۆ ژیان و گیروگرفتەکانی هەیـــە، هـــەروەها ســـیفەتێکە لەســــیفەتەکانی کەســــایەتی دەروون ساغ.

دوای ئـەوەی موسـڵمان بـەڕێ دەکەوێت و خەریکی ئەنجامدانی مەنسـەکەکانی دەبێـت، هەسـت دەکـــات ئیـــش و کارەکـــانی بەشـێوەیەکی رێـك وپێـك (لـە رووی جەســـــتەییو عـــــەقلیو هــــەڵچوونیو کۆمەڵایــــەتی) بــەڕێوەدەچێت. ئــەم کــردارە تـەواوکاری دەروونــی (التکـامل النفســـی) بــــە موســــڵمان دەبەخشێت. ئەمەش سیفەتێکی تــری مرۆڤــی دەروون ســـاغە، هــەروەها ئــەنجامدانی کارەکــان بەشــێوەیەکی رێــك وپێــك هاوســـەنگی (التوافـــق) بـــە موسـڵمانان دەبەخشـێت، ئـەم هاوسـەنگییەش رازی بـوون لـە خـۆو هاوســەنگی کۆمەڵایــەتی دەگرێتــەوە، ئــەم رازی بــوون و هاوســەنگییە کۆمەڵایەتییــە لــە ئــــــەنجامدانی کارەکــــــان بەشێوەیەکی رێك وپێك و چاك رەفتار کردن لەگـەڵ ئـەم خەڵکـە زۆرە دێتـەدی. ئـەم هاوسـەنگییە بەسیفەتێکی گرنگی کەسـایەتی دەروون ساغ دادەنرێت.

بینینــی کەعبــەو نوێژکــردن تێیـــــداو بینینـــــی گـــــۆڕی پێغەمبــەر(د.خ)و نوێژکــردن لــە مزگــەوتی پــیرۆزی، وا لــــە موســــڵمان دەکـــات هەســـت بەبەختیاری بکات. هەروەها ئەم




پاڕانەوەی کە موسڵمان زۆر دووبارەی دەکاتەوە کە لەحەج دەبێتە سروودێکی خواپەرستی، سروودەکەش ئەمەیە (لبیك اللهم لك لبیك، لبیك لاشریك لك لبیك، أن الحمد والنعمة لك والملك، لاشریك لك) ئەم یادکردنەوەو دیمەنانەی کە مرۆڤی موسڵمان لە حەج دەیبینێت ئارامی بە دەروون دەبەخشێت، هەروەها وای لێدەکات کە ڕێز لە خودی خۆی بگرێت و قبوڵی بکات و متمانەی پێ بکات.

موسڵمان لەکاتی ئەنجامدانی مەنسەکەکان و مانەوەی لە مەککە مامەڵە لەگەڵ خەڵکێکی زۆر لە جۆرەها نەتەوەو ڕەنگ دەکات. ئەمەش واپێویست دەکات کە توانای پێکهێنانی پەیوەندی کۆمەڵایەتی پەسندی هەبێت و ئەوانیش خۆشبوویت و متمانەیان پێ بکات و ڕێزیان لێبگرێت و لێبوردەیی بەرامبەریان هەبێت.

هێنانەدی خودو (تحقیق الذات) بەکارهێنانی تواناکان بریتییە لە لەخۆگەیشتن و هەڵسەنگاندنی خود بەشێوەیەکی واقیعیو بابەتی. قەبوڵ کردنی ئەم جیاوازییە لەنێوان تاکەکان هەیە. ئەمانە هەمووی بەشێکن لەهێنانەدی خود، بەڵام لەمانە هەمووی گرنگتر بەدیهێنانی خود بریتییە لە بەدیهێنانی ئامانجەکان، موسڵمانیش کە تەواو دەبێت لە ئەنجامدانی مەنسەکەکان و دەبێتە حاجی، هەست دەکات گەورەترین ئامانجی لەژیان بەدیهێناوە. موسڵمان هەموو تواناو وزەو توانستەکانی بۆ ئەنجامدانی پێداویستییەکانی حەج بەکاردەهێنێت، ئەمەش ڕەفتارێکی ئاساییە، چونکە هەموو تاکەکان هەمان ڕەفتار ئەنجام دەدەن، ئەمە وای لێدەکات هەموو ماندووبوونی خۆی بەرەفتارێکی ئاسایی بێتەبەر چاو. دوای ئەوەی موسڵمان دەگەڕێتەوە بۆ نیشتمانەکەی خۆی هەست بە ئاسایشی دەروونی دەکات.

ئاسایشی دەروونیش بریتییە لە هەستکردنی تاك کە ئەم ژینگە کۆمەڵایەتییەی تێیدادەژیێت ژینگەیەکی گونجاوە، خەڵکی دەوروبەری ڕێزی لێدەنێن و قەبوڵی دەکەن لەناو کۆمەڵگە، ئەمەش بە گرنگترین پێداویستییەکانی تەندروستی دەروونی دادەنرێت.

بەم شێوەیە بۆمان دەردەکەوێت کە هەر موسڵمانێك لەپێناوی ڕەزامەندی خواو بۆ خوای گەورە حەجی کردبێت کەسایەتییەکەی بەشێکی زۆر لە سیفەتەکانی تەندروستی دەروونی لێدێتەدی وەك (کەسایەتی دەروون ساغ، تەواوکاری دەروونی، هەستکردن بەئاسوودەیی، هەستکردن بە خۆشی لەگەڵ خەڵك و ژیان و.. هتد).

## سەرچاوەکان


١. قورئانی پیرۆز

٢. د.حامد عبدالسلام زهران. الصحة النفسية والعلاج النفسي، الطبعة الثانية، عالم الكتب، القاهرة، ١٩٧٧.

٣. د.حامد عبدالسلام زهران. علم النفس الاجتماعي، الطبعة الرابعة، عالم الكتب، القاهرة، ١٩٧٧.





# بنگەهێن باوەری

## پشکا ئێکێ

مقداد عیسا

بنگەهێ (یەکێ) ژ بنگەهێن باوەریێ، یا ب هەبین و ئێك کرنا خودێیە بهەر سێ جورێن خۆڤە کو.

١.ئێك کرنا پەروەردەو خودان کرنێ بوو

٢.ئێك کرنا پەرستنێ بوو.

٣.ئێك کرنا ناڤ ورەوشا.

نها ئەمێ بەحسێ بنگەهێ دووێ بکن ژ بنگەهێن باوەریێ، کو ئەو ژی باوەرێ یا ب مەلائیکەتێن خودێیە.

مە باوەری هەیە کو خودێ هەندەك (مەخلوق) ئافراندنە و چێکرنەو ناڤێ وا دانیە: مەلائیکەت، خودێ گەلەك قەدرێ واژی دگرێ، چنکو ناڤێ وان دگەل خوە تینێ خودێ دبێژێ: ﴿إن الله وملائكته يصلون على النبي/ سورة الاحزاب-٥٦﴾ و دبێژێ: ﴿كلٌّ آمن بالله وملائكته/ سورة البقرة-٢٨٥﴾ و ژبلی ڤا ژی ژ ئایەتێن قورئانا پیرۆز.

هەر وەکی مە باوەری هەیە کو ئەڤ مەلائیکەت چو جارا بێ ئەمریا خودێ ناکن و، هەر دەمی دبن فەرمانا وی دەنە، هەروەکی خودێ دبێژی: ﴿ الله ما أمرهم ويفعلون ما يؤمرون/ سورة التحريم-٦﴾ ﴿ يشهده المقربون/ سورة المطففين-٢١﴾

هەروەسا مە باوەری هەیە کو ئەو هەر دەمێ عیبادەتا خودێ دکن و پەسنێ وی ڤەددن و ژێرە دچن سوجدە، هەر وەکی دبێژێ: ﴿إن الذين عند ربك لا يستكبرون عن عبادته ويسبحونه وله يسجدون/ سورة الاعراف-٢٠٦﴾.

مە باوەری هەیە کو خودێ هەر هندەك ژ وا ب کارەکی ڤە گرێدانە یانی: هندە عەرشی خودی د هلگرن رۆژا قیامەتێ، هەر وەکی دبێژێ: ﴿ويحمل عرش ربك فوقهم يومئذ ثمانية/ سورة الحاقة-١٧﴾ و هندەك دەرگەهڤانێ دۆزەخێنە، هەر وەکی دبێژێ: ﴿عليها تسعة عشر/ سورة المدثر-٣٠﴾ و هەندەك ئینسانا د پارێزن ژ بەلایێن دونیایێ هەر وەکی دبێژێ: ﴿ له معقبات من بين يديه ومن خلفه يحفظونه من أمر الله/ سورة الرعد-١١﴾ و هەندەك ژێ روحا دستینن، هەر وەکی دبێژێ: ﴿حتى إذا جاء أحدكم الموت توفته رسلنا وهم لا يفرطون/ سورة الانعام-٦١﴾ و هەندەك ژێ خێرو گونەهێ خەلکی دنڤیسن، هەر وەکی دبێژێ: ﴿ عن اليمين وعن الشمال قعيد* ما يلفظ من قول إلا لديه رقيب عتيد/ سورة ق-١٧-١٨﴾ ﴿ وإن عليكم لحافظين* كراما كاتبين/ سورة الانفطار-١١﴾ و هەندەك ژێ وەحیێ تینن ژ پێغەمبەرا دە کو ئەو (جبرایلە) سلاڤێن خودێ لسەر بن، هەر وەکی خودێ دبێژێ: ﴿ وإنه لتنزيل رب العالمين* نزل به الروح الأمين* على قلبك لتكون من المنذرين* بلسان عربي مبين/ سورة الشعراء-١٩٢-١٩٣-١٩٤-١٩٥﴾ و جارەکێ دبێژێ: ﴿قل نزله روح القدس من ربك بالحق/ سورة النحل-١٠٢﴾ و و هەندەك ژێ پرسێ ژمریا دکن د تربێ دە هەر وەکی پێغەمبەرێ خودێ دبێژێ: (ان العبد اذا وضع فى قبره وتولى عنه اصحابه انه ليسمع قرع نعلهم، اذا انصرفوا اتاه الملكان، فيقعدانه، فيقولان له: ما كنت تقول فى هذا الرجل محمد؟ فاما المؤمن فيقول اشهد انه عبد الله ورسوله، فيقال له: انظر الى مقعدك من النار ابدلك الله به مقعدا من الجنة، قال النبى (ص) فيراهما جميعا،) (رواه بخاري ومسلم وترمذي).




يانى: چاخىٚ وەكو عەبد تىٚ دانين د تربا وى دە، هەڤالىٚ وى ژىٚ د ڤەگەرن، هنگى ئەو دەنگىٚ پێلاڤێ وا دكىٚ، چاخىٚ هەڤالىٚ وى زڤرين و هەر دوو مەلائيكەت وىٚ بێن و وى روٚنيێن و وىٚ ژێره بێژن: تە چ د دگوت ـ ڤى زلامى رە محەممەد؟ يىٚ خودان باوەر وىٚ بێژىٚ: ئەز شەهدەكى ددم كو ئەو عە ڤدىٚ خودىٚ وپێغمبەرىٚ وييە، وىٚ ژێره بىٚ گوتن: بەرىٚ خوٚ بدە جهىٚچ رونشتناخوە يىٚ ئاگر چاوە خودىٚ ژ تەرە گوهاتيە بيەكى ژ بەهشتىٚ. پێغەمبەر دبێژى: ئەوىٚ هەردووكا ژ ببينىٚ... هتد.

هندەك ژ مەلائيكەتا هەمە د گەرهن و لێكرەرىٚ رونشتنەك دبينن كو بەحسىٚ خودىٚ تێدە بىٚ كرن، تە دى لىٚ كوٚم بوون گوهىٚ خوە دانىٚ، هەروەكى پێغمبەرىٚ خودىٚ بێژىٚ: (**ان لله ملائكة يطوفون فى الطرق يلتمسون اهل الذكر، فاذا وجدوا قوما يذكرون الله تنادوا: هلموا الى حاجتكم فيحفونهم باجنحتهم الى سماء الدنيا**) (رواه بخارى).

## باوەرى يا ب كتێبێن خودىٚ

ئەم زانن كو خودىٚ گەلەك كتێب ئانينە خوارىٚ ژ ئاسمانا دا كو پێغەمبەرێن وى ژ خەلكى رە بێژن و وا پىٚ فێره بكن، ئەم ناڤىٚ هندەك ژىٚ زانن ئەوێن كو دقورئانىٚ دە هاتن، وەكى (تەوراتا) كو ژ (موسا) پێغەمبەر رە هاتى و (ئينجيلا) كو ژ (عيسا) رە هاتى و (زەبورا) كو ژ (داود) رە هاتى سلاڤێت خودىٚ لگشان بن، ژخوە قورئانا پيروٚز سەر سەرىٚ گشايە، مە باوەرىٚ بحەمووچكا هەيە.

ئەڤ كتێب هاتنە خوارىٚ دا خەلك لدووڤ هەرن و شوٚل پىٚ بكەن، بەلىٚ هەر پێغەمبەرەكى كو هاتى ئەو بەس ژ قەومىٚ خوە رە هاتيە، بەس قورئانا مە تنىٚ ژ بوٚ خەلكى دونيايىٚ جن وئينس وحەمووچكايە و وىٚ بمينىٚ حەتا روٚژا قيامەتىٚ ﴿**وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلاَّ كَافَّةً لِلنَّاسِ بَشِيرًا وَنَذِيرًا**/ سورة سبأ-٢٨﴾ يانى: مە تو شياندى بوٚ ئينسانا گشا دا توٚ مزگينيىٚ بدىٚ وا ئەوێن لدووڤ دىٚ چن و وا بترسێنىٚ ئەوێن كو بووتنا تە ناكن، جاردى خودىٚ دبێژىٚ: ﴿**فَلاَ وَرَبِّكَ لاَ يُؤْمِنُونَ حَتَّى يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لاَ يَجِدُوا فِي أَنْفُسِهِمْ حَرَجًا مِمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا**/ سورة النساء-٦٥﴾ يانى: ڤێجە نا، ئەز بخودايىٚ تە سوند د خوم، ئەو ئيمان و باوەر يىٚ نا ئينن حەتا ئەو تەنەكن فەرمان دەر، دچڤا پەڤرە چوونكىٚ كو د ناڤ وا دە چێدبن، و پاشى د دلىٚ خوە دە چو تەنگاڤىٚ و دل نەخوەشيا نەبينن ژ حوكمىٚ بتەمامى رازى بن و وا خوەشبىٚ ئەو حوكمىٚ كوتە كرى.

ما لائقە كو ئينسان لدووڤ پێغەمبەرەكى هەرىٚ و بێژىٚ ئەز ژ (ئوممەتا) وى مە و پاشى بحوكمىٚ وى رازى نەبىٚ و پىٚ نەخوەشبىٚ تشتا كو ئەو بكىٚ؟ ئەڤ نە لائيقىٚ موسلمانايە، ژ بەر ڤىٚ يەكىٚ دڤىٚ كێفا دلىٚ مە لگور حوكمىٚ خودىٚ و پێغەمبەربن، حەتا كو ئەم موسلمانىٚ دروست بن، خودىٚ مە لسەر دينىٚ پێغەمبەرىٚ مە بمرينىٚ ئامين.

مە باوەرى هەيە كو قورئان كەلامىٚ خودێيە و ئاخافتنا وييە(قەديمە) يانى ژ بەرىچ ڤە هەيە نەكو نووهاتيە چێكرن، وە كەڤا تشتىٚ كو خودىٚ ئەو چێكرنە و خولقانديە، ئەڤ قورئان يەك ژ نيعمەتێن خودىٚ ئىٚ مەزنە كو لسەر مە كرى بەلكى ژ حەموو نيعمەتا مەزنترە، ڤێجە دڤىٚ ئەم وىٚ ژ خوە رە بكن رىٚ ناس و لدووڤ وىٚ هەرن، وە كە يوو خودىٚ ژ مە خوە ستييە دبێژيتن: ﴿**وَهَذَا كِتَابٌ أَنْزَلْنَاهُ مُبَارَكٌ فَاتَّبِعُوهُ وَاتَّقُوا لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ**/ سورة الانعام-١٥٥﴾ يانى ئەڤ قورئانا ها كتێبەكە مە ئانينە خوارىٚ خودان خێرو بەرەكەتە، لدووڤ هەرن و ژ خودىٚ بترسن.

**قوتابى كوليجا ئاداب، پشكا خواندنێن ئيسلامى.**




# توێژینەوە لەسەر فیقهی ئیسلامی

# هۆکارەکانی جیاوازی بۆچوونی زانایان لە فیقهی ئیسلامیدا

ئەڵقەی/ سێزدە

مەلا عبداللطیف باموکی

توێژینــەوە لەســـەر فیقـــهی خیـــــلاف و جیـــــاوازی راو بۆچوونـــەکان ئـــەوەندە رەهـــاو بـــەربڵاوو فراوانـــە بەئـــەندازەی گـــەورەیی‌و فراوانـــی ئیســلام، بـــە لەبەرچاو گرتنی زەمەن و کات و توێژنـــــــەوەکانی گـــــــەلانی موســــــڵمان و شــــــوێن و شـــــوێنکەوتوانی رێبازەکـــــانی فیقهی ئیسلامی بەهەردوو باڵی ســـــەلەفی‌و خەلـــــەفی بـــــەمانا فراوانەکەیان، کـــە یەکـــەم بـــڕوای بەدەق هەیە بێ تـەئویل و دووەم بـــڕوای بــــە تـــەئویل هەیـــەو. حەقیقـەت و مـەجازی لەبـەر چـاو گرتـــووە. جائێمـــە لـــەم ئەلقـــەدا هـــەندێ یاســاو رێســای زانســتی سەرەتاو بنەمای فیقهی ئیسلامی روون دەکەینـــەوە، بەمەبەســـتی داگیرسـانی مۆمێك لەبـەردەم ئـەم گەنجینـە فراوان و بەنرخـەی کـە زمـــانی کـــوردی بێ‌بەشـــە لـــە کوردانـدنـــی، دەنـــا لـــە زمـــانی عـــــەرەبی ســـــەدان کتێـــــب و نامیلکەی کورت و درێژو مەتن و شـــەرح و پـــەراوێز لەبەردەســـت و دڵانـــەو لـــە هـــەموو زانســـتەکان زیـــاتر ســـــەرچاوەی فیقـــــهی ئیسـلامی پـێ دەوڵەمـەند بـووە، بـــەڵام پێـــش ئـــەوەی لەســـــەر باســـەکەمان بڕۆیـــن، دوو باســـی زۆر گرنـگ هەیـە دەبێ کـەمێك نـا بـەڵکو زۆر لەســـەری راوەســـتین، ئـــــــەویش: (کۆشـــــــــش، شوێنکەوتن)ن کە بەدوو زاراوەی (اجتهاد، تقلید) ناسراوە، چونکە کـە ئـاییـنی ئیسـلام لـە دەقـە قورئـــانی‌و فەرموودەکانـــــەوە گەیشـت، خـەڵك رەچـاوی پلـەی زانســـت و زانیـــاری‌و کۆششـــی زاناو شوێنکەوتنی عەوامی لەبەر چاو گرتووەو هـەموو رێبازەکـان کە ئێستا بۆتە رێباز کاتی خۆی وەك راو بۆچوونـــــی زانایـــــەك پـەیدابووەو گفتوگـۆو ئـاڵوگۆڕی هـــەڵگرتووەو دەقـــی قورئـــان و فەرموودە، کـە گونجـاو بـووە بـۆ ئەو رێباز یان ئەم رێباز. کۆشش (اجتهاد) لە زمانەوانی عـەرەبیدا بـەمانای هـەوڵ و بـەکارهێنانی توانـــا و جســـت وجۆکـــردن و پـــەیداکردنی بەڵگـــە بـــۆ کـــارێك بەکاردێ ئەوەش هەموو زانست دەگرێتـــەوە، چونکـــە زانســـتی مـرۆڤ مـەند و راوەسـتاو نییـە، بـــەڵکو لـــە جوڵـــەی گەشـــەو پەرەسەندنی هەمیشە لە زاراوەی زانستی ئوسولی فیقهیدا هـەوڵ و کۆششی زانایە، هەرچی لەتواناو وزەیدا هەیە بۆ فێربوون فەرمانە




شەرعییەکان لە ڕێگەو بەڵگەوە. بەپێی ئەم پێناسەیە دەبێ زانا هەوڵ و کۆششی هەبێت و کەمتەرخەم و خەمسارد نەبێ لە پەیداکردنی بەڵگە بۆ حوکمە شەرعییەکان، بەرادەیەك کە ڕەخنەی لێ نەگیرێ کە نەگەڕاوە بەشوێن بەڵگەو دەقی ڕوون و ئاشکرا لەسەر مەبەست، هەر ئەم زانا کۆششکارە مەرجی زانایەتیو کۆششکاری تێدابێ، چونکە هەموو کەس مافی ئەوەی نییە خۆی بەزانا بزانێو بڵێ منیش کۆشش دەکەم و ئەو کۆششە بۆ زانستی شەرعی بێت و لەرێگەی کۆڵینەوەو توێژینەوە بێت، نەوەك بە لەبەر کردنی مەسەلە شەرعییەکان و وەرگرتنی لە زانای تر یان لە کتێب و سەرچاوە نووسراوەکان کەدەبێ ئەم مەرجانەی تێدا بێت:

یەکەم: زمانی عەرەبی باش بزانێ، شێوازی ئاخاوتن، وشەکانی زمان و زانستەکانی ئەم زمانە (نحو، صرف، بلاغتە، أدب) شارەزا بێت، ئەوەش بە تێگەیشتنی دەقەکانی ئەم زمانە، ئەگەر هەمووی شارەزا نەبێت مەبەستی بۆ روون نابێتەوە لە دەقە زۆر بەهێزەکان و رەوانبێژی قورئان و فەرموودە، بەتایبەتی فەرهەنگی زمانەوانی عەرەبیو سەرچاوە باوەڕ پێکراوەکان.

دووەم: قورئانزان بێت، چونکە ئەم قورئانە بناغەیە، دەستوورە، یاسایە، بەڵگەیە، سەرچاوەیە، دەبێ لە حەرفی بێی (بسم الله) هەتا سینی (والناس) شارەزاو بەتوانا بێت، دەبێ ئەم زانایە شارەزای ئایەتی ئەحکام بێت بەئاگاییو زانیاری تەواو، کە ژمارەیان (٥٠٠) ئایەتەو شارەزای هەموو قورئان بێت لەگەڵ چیرۆك و پەندو ژیانی گەلانی رابردوو، هەرچەند ئەم جۆرە زانستە ئێستا لەبەر دەستە وەك کتێبە بەنرخەکەی ئەبوبەکری جەصاص(٣٧٠) وەفاتی کردووە و، کتێبی ئەبوبەکری ئیبن ئەلسەمەری (٥٤٣) وەفاتی کردووە، جگە لەوەش دەبێ ئاگاداری (نسخ) بەواتای هەموارکردنی دەقی قورئان بێت بەتایبەتی کتێبی ئەبوجەعفەری نەحاس (٣٣٨) وەفاتی کردووە. وێرای (سبب النزول) هۆکارو کاتەکانی دابەزینی دەقەکانی قورئان، کە لەم بارەوە زۆر کتێبی نایاب هەیە.

سێیەم: فەرموودەناس بێت کە زانای کۆششکار لەزمان و قورئاندا شارەزابوو دەبێ شارەزای فەرموودەش بێت: راست، لاواز، ئەوانەی کە فەرموودە دەگێڕنەوە، جیاوازی بکات لەنێوان فەرموودەکاندا بە هەموو زاراوەکانی زانستی فەرموودەکە، لەم بارەیەوە وێڕای شەش کتێبە راستەکانی فەرموودە دەیان کتێب لەم بارەوە لەبەر دەستەو بیانووی کەس نەماوە بۆ نەزانین، بەڵام بۆ کۆششکار لەوە زیاتر پێویستە بەتایبەتی فەرموودەکانی ئەحکام کە زانایانی پێشینە سەدان کتێب و نووسراوی زۆر بە نرخ و بەهایان داناوەو، چونکە ئەمڕۆ زانستی سەردەم لە چڵەپۆپەدایە پرشی رووناکی زانستی فەرموودەی گرتۆتەوە هەر کۆششکار بێت دەتوانێ زۆر بەئاسانی شارەزایی تەواوی تێدابکات و هەموو رووداوەکانی هاوچەرخ و سەردەم لەرێگەی فەرموودەوە گفتی لەسەر بدرێت و رای کرچ و کاڵ و دەر لە گیانی ئیسلام بەرپەرچ بدرێتەوەو لەم بارەوە زۆر کاری پڕ بایەخ کراوەو دەکرێ.

چوارەم: زانستی ئوسوڵی فیقهی ئیسلام کە ئەم زانستە زۆر پێویستە بۆ کۆششکارو زانای فیقهی ئیسلامی، چونکە




ئەم زانستە بەڵگەکانی شەرعی ڕێکدەخات و بنەماو ڕێسایان بۆ دیاری دەکات و شێوازی وەرگرتنی حوکمە شەرعییەکان دیاری دەکات و جۆرەکانی دەلالەتی وشە لەسەر ماناو مەبەست ڕووندەکاتەوەو لەکاتی ناکۆکیو نا تەبایی لەنێوان دەقەکاندا ڕێگای هەڵبژاردنی بەهێزەکان دیاری دەکات. ئەم زانستە دەیان کتێبی نایاب و کۆڵینەوەی هاوچەرخ و سەردەمی لەسەر نووسراوە لە چوارچێوەی بەرنامەیەکی زانستی لەبەردەستە سەرچاوەی زانیاری یاسادانەرو دادوەرو موفتیو پارێزەرانە.

پێنجەم: زانینی هەمەدەنگی پێشینەکان، ئەمڕۆ هەمەدەنگی دروست نابێ لەبەر جیاوازی بیروباوەڕو راو بۆچوونی زۆر جیاواز لەناو ڕێبازە پەسەندەکانی فیهی ئیسلامی، بەڵام زۆر حوکمی شەرعی هەیە، کە بەهەمە دەنگ (اجماع) چەسپاوەو شکاندنی ئەم هەمەدەنگییە نەك هەر زیانی بۆ باوەڕدار هەیە، بەڵکو زۆر حوکمی شەرعی کە لەم ڕێگەوە هاتووە بەڵگەی ئایەت و فەرموودەی لەسەرەو لەخۆڕا نەهاتووە. چونکە هەمەدەنگی دەبێ ناکۆك نەبێ لەگەڵ دەقی قورئان و فەرموودەو بیروڕای یارانی سەردەمی پەیام و سروش، کە (٢٣) ساڵ سەردەمی پێغەمبەرو (٣٠) ساڵ سەردەمی خەلیفە راشدەکان دەگرێتەوە، پاش ئەوە هەمەدەنگی نەماوەو نەبووەو ئەگەر باس لە بەڵگەیەتی دەکەین بۆ ئەو سەردەمەیەو شوێنەکانی دیاری کراوەو دەبێ کۆششکار ئاگادار بێت سنوورەکانی نەبەزێنێ، چونکە ئەم سنوور بەزاندنە هەندێ ڕێبازی توندڕەوو لاگرو پەرگرو نادروستی پەیداکردووە لە فیقهی ئیسلامیو ئینکار کردنی زیانی هەیە بۆ زانای شارەزا.

شەشەم: شارەزایی لەمەبەستەکانی شەریعەتی ئیسلام و هۆکارەکانی حوکمە شەرعییەکان و بەرژەوەندی خەڵك بۆ ئەوەی بتوانێ حوکمی شەرعیو فیقهییەکان ناراستەوانەوە وەربگرێ، کە لەدەقەکاندا نەهاتووە لەڕێگای قیاس و بەیەك چواندن و نەریت و عادەتی کۆمەڵی شەرعیو عورفی باوی ڕەسەنی خەڵك ڕەچاو بکرێ لەکاتی حوکمداندا.

حەوتەم: کۆمەڵە توانایەکی خۆڕسکە کە زۆر پێویستەو مەرجی مەرجەکانەو ئەگەر هەموو مەرجەکانی پێشوو هەبێت، بەڵام کۆششکار توانای کۆششی نەبێ لە رووی ژیریو زیرەکیو بەرچاو ڕوونیو حازر وەڵامیو تێگەیشتن و زەینداری، ئەوا ناتوانی سوود لە زمان و قورئان و فەرموودەو زانستی ئوسوڵ و هەمەدەنگی وەربگرێت و کێشە تازەکان و مەسەلە نەوباوەکان لەگەڵ دەقەکاندا بگونجێنێ، لێرەدا پرسیارێك سەرهەڵدەدات، کە چۆن هەڵکەوتووانی پێشینەی ڕێبازە ڕەسەنەکان توانیویانە ئەو ڕێبازانە ڕەچاو بکەن و پەسەندی بکەن لەکاتێکیشدا بەئەندازەی ئەمڕۆ زانست لەبەر دەست نەبووە؟ لەوەڵامدا دەڵێین: ئەوانە لەسەردەمێك ژیان و گوزەرانیان کردووە کە ژیان ئاڵۆز نەبووە، مەسەلە شەرعییەکان ئەوەندە ئاڵۆز نەبووە، نزیك بوون لە سەردەمی پەیامی ئیسلام، سەرجەم بۆ فیقهی ئیسلامی کاریان کردووە.

خوێنەری بەڕێز کە ئەم مەرجە زۆر سەرەکیو بەنرخەی کۆششکار تەماشا دەکەی هەست بەدوو شتی گرنگ دەکەی:-




یەکــەم: گوســتاخی بــەرچاو قــایمیو بــیٚ شــەرمی ئەوانــەی تەنــها دوو ئایـــەت یـــان دوو فەرمووده لەبەر دەکەن و شەن و کەوی فیقهی ئیسلامی دەکەن و بەراســـت و بەچـــەپ لەســـەر حەرام و حەلاڵ و کوفرو بـاوەڕو راست و چەوت رادەردەبڕن و خۆ دەکـەن بـە پاسـەوانی دۆزەخ و بەئارەزووی ئەوان خەڵك دەچـیٚ بۆ بەهەشت و دۆزەخ.

دووەم: مـەزن و گـەورەیی ئـەو کەڵە پیاوانە کە لەگەڵ نەبوونیو کـــەم دەرامـــەتیو هۆکـــاری نووســـین و چـــاپ و زانســـتی ســـەردەم لـــە وردتریـــن راو بۆچوونیـان بـەموو لـە قورئـانی پـیرۆزو فـەرمووده لایـان نـەداوە تەنـها دەگەڕێتـەوە بـۆ یارمـەتی خودا پەرستی ئەو زانایانـەو زۆر بـــەئاگاداریو پارێزگـــاریو هۆشیاری کۆششیان کردووە لەو شـوێنەی کـە دەق نییـە، چونکـە ئەگەر دەق هەبوو ئیجتهاد نییـەو جیـاوازی زانـاو نـەزان لـەگۆڕێدا نییـــە تەنـــها لـــەو شـــوێنە ئیجتـهادیان کـردووه، کـە بەڵگـە هەیــە، بــەلام جێگــەی گومانـــە پێویســـتە زیـــاتر بـــەدواچوونی لەســـەر بکـریٚ هـەتا دەرئـەنجام رایـــەکی پەســـەندو گونجـــاو دروست دەبیٚو ئـەویش قایلە بۆ گـۆڕان. هـەروەها لـەم باسـەوە روون دەبێتـــەوە کـــە کۆشـــش پـــەیوەندی بـــەکات و شـــوێن و کەسەوە نییـە، تەنـها پەیوەسـتە بەهاتنـە دی مەرجـەکان، ئـەوە لەرێگەدایەو کات و شوێن نەزۆك نییـەو ئەگـەر لەلایـەن هـەندیٚ زانـاوە باسـی ئـەوە کرابێـت کـە ئیجتـهاد نـــەماوە ئـــەوە بـــۆ داخســـتنی کەلێنـــە بـــەرووی نـەزان و نـەفام و هەوەسـکاری. ئـەمڕۆ دەرگـای ئیجتـهاد لەسـەر پشتەو پەیوەندی نییە بـەچین و توێـــژو رەگـــەزو نەتـــەوەو وڵاتێکـــەوە، لەفەرموودەیـــەکدا هەیە (اذا اجتهد الحاکم فاصاب فلهو اجران، وان اخطأ فله اجـر واحـــد) لەبـــەر ئەوەیـــە کـــە موجتـەهید دەتوانـیٚ رای خـۆی بگـۆڕیٚ لەمەســـەلەیەکەوە بـــۆ یەکێکی دیکەو، نابیٚ کۆششکار شـوێن پێـی زانایـەکی دیکـە بکــەویٚ، ئەگــەر بەقەناعــەت و بەڵگـــەوە رایەکـــەی خـــۆی سـەلماندو بـاوەڕی پـیٚ هـەبوو، هەروەها زۆر جارێك رێکدەکەویٚ زانایەك لەهەندیٚ مەسائیلدا زۆر شارەزاو بلیمەت و هەڵکەوتووەو بەلام لەهەندێك کەمتر ئەوە زیانی کۆششـکاری نییـە وەك زانایـەك تەنـها لـە تـەلاق یـان مـیرات یـان بەشـێك لـە فیقـهی ئیسـلامی شـارەزایی هەیـە. لـە ئەلقـەی داهـاتوو بـاس لـە شـوێنکەوتن (تقلیـد) دەکـەین، چونکـە زۆر پێویستە.




# ژیانا پێشەوایێ خودانیاس و سەرکردێ قەهرەمان سەلاحەددین ئەیوبی

## ماهیر مستەفا

ناڤێ وی (سەلاحەددین یوسف کورێ ئەیوبە) دامەزرێنەرێ دەولەتا ئەیوبیە، وەل نەژاددا کوردە ل گوندێ (دوێن) ژ دایك بووە ل پشکا (ئازار بایجان) ل کوردستانا باکور وە هندەك د گەل ڤێ دیتن و بۆ چوونێنە کو ل (تکریت) ژدایك بووە سالا (١١٣٨)ز، ئەڤی چەلەنگی وەختێ قودس رزگار کر بن دەستێ خاچ پەرستا بەرەڤ وەلاتێ میسرێ چوو (شێرکۆ)یێ مامی وی دگەل دابوو، پشتی رزگارکرنا وەلاتێمیسرێ مامێوی بوو پاشایێ باژێرێ (ئەسکەندەرییێ) کۆ دکەڤیتە سەر دەریا ناڤەراست، وەختێ مامێ وی دچیتە بەر دلۆڤانیا خودێ سەلاحەدین سالا (١١٦٩)ز وەلاتێمیسرێ ئێخستەبن دەستێ خوە، ل وی وەختێدا ژییێ وی (٣١) سالا بوو.

وەك سالا (١١٧٥)ز شیا وەلاتێ میسرو شامێ کونترۆل بکات وسەر پەرشتیێ هەردوو وەلات بکەن، سەلاحەدین توشی شەرەکی مەزن بوو دگەل خاچ پەرستا ل جهێ شەری (حطین) بوو ل وەلاتێ شامێ د ئەنجامدا سەرکەفتنەکا مەزن بدەست ئینا هەر وەسا ل ناڤەراستا مانگا رەجەب سالا (٥٨٣)ك (١١٨٧)ژ قودسا پیرۆز رزگار کر بن دەستێ خاچ پەرستا.کو ل وی وەختێدا سەرکردێن خاچ پەرستا بریتی بوون ژوان کەسان (مەلیك فردریکی ئەلمانی) و (فلیبی فەرەنسی)و(ریتشارد قەلبولئەسەدی ئینگلیزی)، وەك سالا ١١٩٢ز دوماهی هات ب(صلح الرملە)، سەلاحەددین ل پشکا ژووری باژێرێ قاهیرەدا کەلهەك دروست کرد ل سەر چیایێ (مقطم) کۆب تەواوی باژێرێ قاهیرەیێ لێ دیارە ئەڤ شورایە هەتا ڤی چاخێن یامای.

ناڤێ وی کەلهێ نا کەلها شاخاوی کەلها قاهیرەش بێژنێ هەروەسا کوچکەك یاناڤ وێ کەلهێ دروست کری بۆ جێگر بونا خوە هەر وەسا ل ناڤ وێ کەلهێدا بیرەکا مەزن یا لێدای نها ببیرا (یوسف) ناو بانگە بیرا (خلدون)ش بێژنێ.

سەلاحەددین ب مەزن ترین کەسێن مێژوودانن چنکو سەرکردەکێ مەزنێ سیاسیو قسە جهێ هاتی بوو هەر چ سیفەتەکێ جوان هەبیت لناڤ ڤیکەسیدا یێ هەی، هەروەسا د ناڤبەرا توندو تیژییو سینگ فروانییێدا زۆر یێ خودێ نیاس و باوەر ب هێز بوو.

(فەرەنجی) زۆر سەرسورهێنەر بوون ل رەوشتێ ڤی چەلەنگی وەکربوو منیاك کەس ل پشکا رۆژهەلاتێ، ریتشارد قەلبولئەسەدی ئینگلیزی ئێك بوو ل سەرکردێن خاچ پەرستا ناوبانگ ئیعتراف ڤێ حەقیێ کرو هەمی موزەخانێن خوە تەسلیم کرن.







# ئەو دەسکەوت و ڕووداوەی هەرگیز لەیاد ناکرێت

قاسم بەرزنجی

ڕووداو گەلێك هەن هەرگیز لەبیر ناچنەوەو لەساڵ یادو بۆنەو ڕۆژە تایبەتەکاندا مۆم و چرای پڕ شکۆو سەروەری‌و هەندێك جاریش خەمگینانەو کزیان بۆ دادەگیرسێنرێت، هەڵبەتە بەهەڵدانەوەو چاو لێ کردنی دوو توێی پەڕەکانی ڕۆژگارو مێژووی نەتەوەکەشمان فرە نموونە بەرروومان هەڵدەشاخێنەوە. لەوانەش دامەزراندن و ڕۆنانی یەکەم بەردی بناغەو دواتر هەڵتەکاندن و شەهید کردنی کۆماری کوردستانە لەشاری مهابادی ڕۆژهەڵاتی کوردستان، ئەو کۆمارەی کە کەمتر لەساڵێك هاتە دامەزراندن و چوارچێوەو شەرعیەتی بەخۆیداو، وەکو خەونێکی لەمێژینەو زیاتر لەدوو سەدەی کوردستانی بێ ئالاو دەوڵەت و ژێر دەستەی داگیرکەران، بووە سۆمای چاوو شنە بای فێنکی ڕوح و چۆڕە ئاوی زاری وشکی هەموو ئەوانەی تامەزرۆ بوون سەرخەوێك لەژێر پەرچەم و سێبەری دەوڵەتێکی کوردی بشکێنن، هەر لەم ڕوانگەیەشەوەو لەرووی هەستی نەتەوایەتییەوەو بۆ سەرخستن و بەرفراوان کردن و شکاندنی سنوورە دەستکردەکان یەکێکی وەك بارزانی ئەمرو هاوەڵەکانی بەشداری لەم ئەزموونە دەکەن و دەبنە پێشمەرگەو بەرگریکارو بەشێك لە کێشەو ڕووداوەکان. دواتریش پشتی نسکۆو لەدار دانی سەردارو پێشەوای شۆڕشی کۆماری کوردستان ئەمانەت و ئالاکە وەردەگرێت و درێژە بە خەبات و نەپسانەوەی شۆڕش دەدات و بۆ دوژمنانی دەسەلمێنێ، کە نەخێر کورد ژێر دەستی‌و زۆرداری ڕەت دەکاتەوەو سەری بەرزی نانەوێنێ. گرنگ کەوتن نییە، بەڵکو گرنگ هەڵسانەوە، کە لەکەوتندا فێرە هەڵسانەوە دەبین. ئەوەی ئەمرۆش لەم بەشەی کوردستان لەسایەیدا پەرلەمان و حکومەتی هەرێمی کوردستانی لێ لەدایك بوو ئاکام و بەرهەمی خوێنی شەهیدان و هەوڵ و کۆششی




چەندین ساڵەی کۆڵنەدان و شێلگیریو دڵسۆزی موریدو شاگردو خەمخۆرانی ڕێبازی مەلیك مەحمودو شێخ لەقەوارەی سیاسیو سنوورو چارەنووسی نەتەوەکەیان کردۆتەوە، شێخ مەحمود ویستوویەتی کورد مەملەکەتی




سەعیدی پیران و شێخ سەعیدی پیران و قازی محەممەدو شێخ عەبدولسەلامی بارزانیو بارزانی نەمرە. لێرەشدا تەنیا ئەوەم مەبەست نییە بڵێم، کە هەڵگرانی مەشخەڵی شۆڕش و ڕاپەڕینەکان پیاوانی ئایینیو زاناو بنەماڵەی ناودارن، بەڵکو چەندان وەکو زانای ئایینیو ڕابەری تەریقەتیش بوون، بەڵام ئەوەیان بەزەرووری ترو لەپێشەوەتر زانییەوەو بیریان هەبێت و قازی محەممەدیش کۆمارێك، هەرگیز ترسی ئەوەشیان لەدڵدا نەنیشتووە، کە بەم کارەیان گوناهێکی گەورەیان کردبێو خواش لێیان نابوورێ. نەخێر بەم کارەیان (حب الوطن من الایمان) فەرموودەکەی پێغەمبەری سەرورمان محەممەد(د.خ) بەجێ هێناوە، هەروەها ئەم ئایەتەشیان باش هەزم کردووە، کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿**يَاأَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ/**

سورة الحجرات-١٣﴾ بۆیەش ئەو ئەرکەی هیچ دوودڵیو گومانێکی بەدواوە نەبێ نیشتمان پەروەریو کوردایەتییەو دەکەوێتە ئەستۆی هەر هەموومان، لەبەراییش ئەوانەی خۆیان بەموسڵمانی ڕاستەقینە دەزانن و دەیانەوێ خزمەت بەئایینی پیرۆزی ئیسلام بکەن.

ئارام و ئاسوودە بێ ڕۆحی بەرزە فڕی قازی محەممەدو هاوەڵەکانی. بەرزو شکۆدار بێت یادی یەکەم کۆماری کوردستان.

نەیارو دوژمنانی کوردیش ڕوو ڕەش و شەرمەزار بن.




# بۆ ئەوەی مێژوو بناسین

سۆزان حەسەن

هەر کاتێك بمانەوێت باسی ئایینی پیرۆزی ئیسلام و مێژووەکەی بکەین دەبێ ناوی کوردو کەلتورەکەی بەبەشێکی دانەبڕاوی ئەم ئایینە سەیر بکەین، جگە لەوەش دەبێ باسی قوربانیو خزمەتەکانی کورد بکەین بەم ئایینە، دیارە ئەمەش مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای فتوحاتی ئیسلامی لەناوچە کوردییەکان، بەڵام ئەوەی وەك فاکتەرێکی یەکجار کاریگەر لەسەر دروست نەبوونی دەوڵەتی کوردی ڕەنگدانەوەی هەبووە بوونی ئەم چەند دەسەڵاتدارە دراوسێیانە بووە، بەتایبەت ئیمپراتۆریەتی عوسمانی کە ئەو کاتە پانتاییەکی بەرفراوانی جوگرافیو ئیداریو سەربازی داگیر کردبوو، وەك تاکە دەسەڵاتداری ناوچەکەو لەژێر پەردەی بەرگری کردن و حوکمی شەرعی بەهەموو شێوەیەك بەربەست بوون لەبەردەم دروست بوونی دەوڵەتی کوردی، هەرچەندە ئەگەر کۆمەڵێك ئەگەرو کێشەی ناخۆش ڕۆڵێکی سلبیان گێڕابێت، بەڵام هەستی دەمارگیریو خۆپەرستی دەسەڵاتدارانی ئەو کاتەی عوسمانیو ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی زیاتر جێگای مەترسی بوو لەسەر میرنشینە کوردییەکان و، زۆر جار بەبەهانەی ئەوەی کە بەرگری لە ئایینی پیرۆزی ئیسلام دەکەن لە شەڕە گەورەکان کورد زەرەرمەندی گەورە بوو، بەڵام بەهیچ شێوەیەك بۆی نەبوو باسی مافی کەلتوری نەتەوەیی خۆی بکات، چونکە بەکافرو لادەر لە بەرنامەی ئایینی ئیسلام دەدرایە قەڵەم. ئەوەی زیاتر بۆ هەردوو ئیمپراتۆرییەتی دراوسێ مایەی ئەرزش بووە زوو قەناعەت پێ کردنی میرو پادشاکانی کورد بوو بەبیانووی بەرگری کردن لە ئیسلام، بۆیە لەناوبردنی دوایین میرنشینی گەورەو بەرفراوانی کوردیش کە میرنشینی سۆران بوو هەر لە ژێر پەردەی ئەم بروبیانووانە تووشی لەناوچوون هاتووە، بۆیە دەکرێ وەك مێژوو ئیمپراتۆرییە دراوسێکان و ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی بەتایبەتی بەهۆکاری سەرەکی دروست نەبوونی دەوڵەتی کوردی بزانین، بەڵام دەکرێ کورد لە هەموو ئەم تاقی کردنەوەو ئەزموونانە سوود وەربگرێو تووشی هەڵەی مێژوویی نەبێو ئەم دەرفەتەش یەکجار لەبارە بۆ دروست بوونی دەوڵەتێك بەناوی دەوڵەتی کوردی.

# (زوهدی) مەلا شێخ تاهیر سەرانەیی (١٩٢٢-١٩٨٨)و چەند پارچە شیعرێکی بڵاونەکراوە



**تاریق جامباز**

زوهدی نازناوی شاعیرێکی خواناسی خەمخۆری چاکەو خێرو بێری ناوچەکەیان بووەو هەرچەند لە توانای دابێ بۆنەتەوەکەی درێغی نەکردووە لە خزمەتکردنی دەڤەرەکەی. ئەم زاتەش لە بنەماڵەیەکی ئایینی پەروەری نەتەوایەتی بەناوبانگن و رۆڵێکی کاریگەرو دیاریان لەسەرەتای چەرخی بیستەمدا هەبووەو چەندان کەڵەپیاویان تیداهەڵکەوتووە (پیری کۆسەو شێخ کاکە ئەمینی سەران و شێخ عەبدولڕەحمانی سەران و مەلا عەبدوڵلای سەران و... هتد) بۆیە لەزۆر سەرچاوە چ کتێب یا گۆڤار یا رۆژنامەو بڵاوکراوەی دیکە ناویان هاتووەو ئاماژە بۆ رۆڵی لەبەر چاویان کراوەو ئەم بنەماڵەیە نامەو نووسراویان بۆ زۆر سەرکردەی کوردی ناردووەو بۆ هاتووە (شێخ مەحمودی نەمرو سمکۆی شکاك و شێخ ئەحمەدی بارزان و...هتد)و چەندان نامەی ئەوسای بەرپرسی عوسمانییەکانی بۆ هاتووەو، جگە لە سەران ئەوا تەکییەی شێخ کاك ئەمینی لە رەواندوز هەبووەو، ئیرادەیەکی مەلەکی لە ساڵی ١٩٣٩ لەم بارەیەوە دەرچووە.

زوهدی نازناوی مەلا شێخ تاهیر شێخ نەجیب کوڕی شێخ کاك ئەمینی سەرانە، لە ساڵی ١٩٢٢ لە گوندی بلەی ژێری سەر بەناحیەی خەلیفان چاوی بەشاخەکانی ئێرون و کەوبارو سەرسیو هەڵێناوەو لای مامۆستایانی ئایینی لە گوندی هەرتەڵی خۆشناوەتی (مەلا فەتحوڵڵا)و لە گوندی خەتێ (مەلا ئیبراهیم)و لەسەران (مەلا عەبدوڵڵا)و لە رەواندوز (مەلا ئەسعەد ئەفەندی خەیلانی)و لە کۆیە (مەلا محەممەدی جەلی زادە) خوێندویەتیو، ئینجا ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووەو لە گوندی خۆیان (بلەی ژێری) بە مەلایەتیو کارو کاسبی خەریك بووەو، لە گەنجایەتی خولیایی هۆنینەوەی شیعری بووەو توانیویەتی چەندەها پارچە شیعر بنووسێتەوە، بەڵام بەداخەوە هەمووی کۆنەکراوەتەوەو هەندێکیان لای منن بەپێویستم زانی بڵاویان بکەمەوە.




ئەم زاتە لە ساڵی ١٩٨٨ ئەو کاتەی دووکەڵی سووتانی دۆڵی ئاکۆیان و گەرەوان و سەران ناوچەکەی بەتەمێکی رەش داپۆشیبوو، ئا لەم کاتەدا لەم ئێوارەیەدا بەهاواری پیری سەرانەوە چوو و گەیشتە مەنزڵگای ئەبەدی.

نەك زوهدی تەنیا شیعری داناوە، بەڵکو بەنامە گۆڕینەوە بە وتەی نەستەق و گاڵتەو گەپەی ماموٚستایان (مەلا ئەحمەدی تموتیو فەقێ سمایل شیری)ی بەسەر کردۆتەوە.

## مەلای گەورەی کۆیەو زوهدی

ئەو ماوەی کە زوهدی بە فەقێیاتی لە کۆیە دەبیو ئەوەیزانراوە چناروك هاوینەهەواری مەلای ماموٚستای گەورە بووەو ئەو کات دز فێرە دزینی بەروبوومی باغی ماڵی ماموٚستا دەبن، فەقێ تاهیریش زۆر پێی ناخۆش دەبێ، بۆیە یەکسەر بۆ ماموٚستای دەنووسێ کە لە کۆیە دەبێ:

زەر زوور زەعەروری زەرعی چناروٚکی خوارد

بیانگرین یان بیانکوژین

ماموٚستا لە وەڵامدا بۆی دەنووسێ:

کوڕم زەرە زەری پێ ناوێ    نەبیانگرن، نەبیانکوژن

فەقێ تاهیریش (زوهدی) دەترسێ، نەوەك ماموٚستا لە قسەی دڵگیرو دڵگران بێ، بۆیە بەم دێرە شیعرە داوای لێبوردنی لێ دەکات:

قوربان لێم عادز نەبی نەوەك مەعلومە ئەمرم

ئەمن خادیمی خادیمەی ئوختی خدرم

ماموٚستا بەم جۆرە وەڵامی دەداتەوە تاکو هیچی لەبەر دڵی نەمێنێ:

کوڕم لێت عادز نیمە شیرین کەلامی

لەحوسن و سورەتا شابی جینانی

لەقەدو قامەتا یوسفی سانی

سەگی ئەسحاب (الکهف) جێی جەنەتە

کەری عالیمانیش جێیان بەهەشتە

ئاهە لە رۆژی چاوەڕوانی هاتنی عیزرائیل

عەبدی مسکین لەم دەمە کێ بێ لە تۆ زیاتر زەلیل

وا ئەزانی نامرێ لەم مەسکەنە ناکەی رەحیل

غافل و ناهۆش لەحالت کوانێ حوجەت کوا دەلیل

رەبی "تبدل" من ذنوبی یا رسول اللە دخلیل

لاشەکەت کەوتۆتە سەر خاك لیفکو سابون مەیت شۆر





هەندێکیش جێگەت بۆ ساز کەن قەبرێکی تاریک و قۆڕ
گوێچکە کەڕ، زوبانە لالت، هەردوو چاوت بوینە کوێر
وا ئەزانی نامری ئەم جەسەدەت نابێ بە خۆڵ
سەد هەزار جاران دەخالەت یا رسول اللّه دخیل

چوار نەفەر لاشەت هەڵئەگرن وا ئەڕۆن بۆ قەبرستان
گشت کەس و ئەولادو خزمت بۆت ئەکەن گریە و فیغان
کوا ئەنیست، کوا جەلیست بێ رەفیق و ماڵ وێران
بێ کەسی و کەوتویە ژێر خاک بێ چراو تاریکستان
سەد هەزار جاران دخیلک یا رسول اللّه دخیل

دوو مەلەک دێن، لێت ئەپرسن دین و مەزهەب و کەلام
چیت لەگەڵ خۆ کرد لە دونیا ماڵ وێران بووی نەفام
قەسرو کورسیو تەخت و بەختت بەش بەش ئەکرێتن تەمام
شوکری تۆ ناکەن لەپاش تۆ واریث و ئاشنات بەعام
سەد هەزار جاران دخیلک یا رسول اللّه دخیل

مەرهونی ئەعمالی خۆتی عومرەکەت دا بە فەنا
شک نییە ئەوی لەدونیا عەیش و نۆشت گشت ئەڕوا
فەرسەتە تۆبەی بکە، مەرد بە لە دەرگانەی خودا
بەسیە غەفلەت روو لەخوا کە تاکو ماوی فەرسەتە
سەد هەزار هاواری تۆ کەم یا رسول اللّه دخیل

(زوهدی یە) مائیوس مەبە روو کە لە قاپی مستەفا
ئایەتی لا تقنطوا حەقە لە ئایاتی خودا
غافری زەنبت خودایە، هەر ئەوە ئەهل العطا
یا رسول اللّه دەخالەت شافیعی رۆژی سەرا
نادیم و مەنکوسە رەئیسم یا رسول اللّه دخیل

رواندوز ١٩٨٥/٣/١

*****

بەناوی خودای رەحمان الرەحیم
تەوفیقم بدات خودای کەریم

بوتان بەعس کەم زبح ئیسماعیل
خودا ئەمری کرد ئیبراهیم خەلیل

مەدحی ئەمانە قەد تەمام نابێ — مەخسوس خودان ئەبێ هەروا بێ
شەوێک لە شەوان ئیبراهیم خەلیل — لەخەونا پێی گوت خودای خەلیل
تاقە کوڕەکەت ناوی ئیسماعیل — من لە تۆم ئەوێت بەبێ قالوقیل
تەقدیر وایە ئەمری سوبحانی — ئیسماعیلم ئەوێ بیکەی قوربانی
شەوی دووەمەو سێیەم خەون هەروایە — ئەمجارە زانی ئەمری خودایە
هیچ شک نەما تەسلیم بوو جوان — کوڕی ئیسماعیل بکاتە قوربان
ئینجا ئیبراهیم خەلیلی خودا — دەچووەوە بۆ ماڵ بە غەم و جەفا
چەقوەکی تیژ و گوریسی هەڵگرت — بۆ لای ئیسماعیل تەشریفی ئەبرد
گوتی کوڕی خۆم حازربە ئەم جارە — بچینە مینا لە بۆ پشتە دار
گوتی ئەمرەکەی بابی عەزیزم — چ ئەمر بکەین ئەمن موتیعم
لەمەکە بەڕێ بوون بچنە مینایی — شەیتانی مەلعون کەوتە سەمایی
گوتی قەد نابێ ئیبراهیم خەلیل — بکاتە قوربانی کوڕی ئیسماعیل
گوتی نابێ بهێڵم ئەمرۆ ئیبراهیم — ئیتاعە بکات بۆ خودای عەلیم
هاتە لای ئیسماعیل مەلعونی لەعین — گوتی ئیسماعیل مەعلوم کە یەقین
بابت چەقوەکی تیژی وا هێنا — بتکوژینەوە لە ئەرزی مینا
ئەڵێت خەونم دیت ئیسماعیل قوربان — ئیشی وا نەبووە لەسەر رووی جیهان
زوو خۆت خەلاس کە هەڕوەواوە — بەڵام گەر نەرۆی ئیشت تەواوە
ئیسماعیل جوابی دا زوو بە مەردانی — پێی گوت مەعلوم ئەتو شەیتانی
ئێستات رەجمەکەم بە بەردانە — لەعنت و رەجم هەر بۆ شەیتانە
پێی وت ئەی مەلعون زۆر باش بزانە — بابی من بابی پێغەمبەرانە
گوتی تەڵەب کا روحی ئەولادی — واجیبە بیکە بەبێ عنادی
من لەگەڵ بابم عەبدی ئەوینە — چی لێمان بوێ ئێمە رازینە
ئەمجارە رۆیشت شەیتانی رەجیم — زوو خێرا خێرا چوە لای ئیبراهیم
گوتی ئیبراهیم قسەم تەواوە — کوشتنەوەی ئەولادی قەت نەبیستراوە
بەم خەونەی دیتت قەت عەمەل مەکە — ئەم تاقە کوڕەت بێ موراد مەکە
گەر ئەتەوێ خێر خێر گەلێ زۆرن — خۆت و ئیسماعیل فیکر بگۆڕن
ئیبراهیم فەرموی دیارە شەیتانی — من پێغەمبەرم بەئەمری سوبحانی




خەونەکەم راستە هیچ شکم نییە
کوشتنەوەی کورم ئەمری رەبییە

ئەمجارە شەیتان کەوتە خەتەرە
گەڕاوە مەککە بۆ لای هاجەرە

گوتی هاجەرە زو زو بەعەجیل
بگە ئیبراهیم لەگەڵ ئیسماعیل

ئێستا کوڕەکەت لێ ئەکوژنەوە
بەروح ئیسماعیل نابینیتەوە

قەت نەزاندراوە لە دەورو زەمان
هی وەک ئیسماعیل ببێتە قوربان

ئەڵێت خەونم دیت ئیبراهیم خەلیل
بیکەمە قوربانی کوڕم ئیسماعیل

ئەمجا زوو برۆ بگە ئەو مەکان
تاکو ئیسماعیل نەبووە بێ جان

هاجەرە جوابیدا زۆر بە هوشیاری
ئیبراهیم خواناسە نەک هەر بە زاری

ئەگەر ئەمر کا خودای جەلیل
بیکە قوربانی کوڕت ئیسماعیل

هەر بەبێ تأخیر راست و رەوایە
هیچ مانع نییە ئەمری خودایە

ئینجا شەیتان مەلعونی لەعین
هیچی پێنەکرا زۆر دەبوو غەمگین

ئینجا ئیبراهیم رەسولی خودا
چوونە جێی مەقسود بە ئەرزی مینا

گوتی رۆڵە گیان ئەی تاقە کوڕم
فکرەکەم هەیە تا بۆت دەربڕم

سێ شەوە لە خودای خوای منان
ئەمری پێ کردووم بتکەم قوربان

یا بنی اني ارى في المنام
اني اذبحك فانظر ماذا ترى

رەئیت دەربڕە روحی رەوانم
من لەتاوی تۆ زۆر پەرێشانم

جوابی داوە زۆر بە مەردانی
ئێستا بێ تأخیر بمکە قوربانی

هیچ تأخیر مەکە ئەمری خودایە
ئەبێ رازی بین ئەمە بەلآیە

یاخوا بەخێر بێ بەلآی عەزیزیم
ئەمری خودایە ئەمن پێ رازیم

ئینجا ببەستە دەست و پایانم
بمخەرە سەردەوم مەنۆڕە چاوانم

بەدەستی راست تۆ بگرە (سکین)
زوو لێ بخشێنە دڵ مەکە غەمگین

دونیا هەر وایە هەروا ئەمێنێ
بە دین و بێ دین کەس لێ نامینێ

هیچ چارەت نییە ئەمری خودایە
دونیا فانیە جەنەت بەقایە

وەقتی چوویەوە بۆ شاری مەکە
بارێکی سەلام لە دایکم بکە

بڵێ سەلامی هەبوو کوڕت ئیسماعیل
گوتی بەدوعا بۆ خزمەت جەلیل

بڵێ ئازام کە دایکی عەزیزم
ئینشا اللە لە قیامەت ئەمن دەلیلم

مەوعید بەهەشتە جێگەی ویسالە
جەزەع و فەزەع هەمووی بەتاڵە

باسەبری هەبێ هیچ نەکا فیغانی
ئەمری خوایە ببمە قوربانی




ئینجا ئیبراهیم عەزم و جەزمی کرد
ئیسماعیلی بەست زۆر بە دەست و برد

چەقۆی دەرهێنا نایە سەر گەروو
دونیا ئەلەرزی ئاسمان تێک چوو

چەند مەلائیکەت لەسەر ئاسمان
هەمووی هاواری کرد یا خوای منان

تۆ رەحم بکە بە شێخ (کبیرا)
تۆ رەحم بکەی بەتفلی (صغیرا)

هەر تۆ ئەناسی رەحیم و رەحمان
ئیسماعیل عەفووکە مەیکە بە قوربان

فدیە بنێرە بە لوتفی کەرەم
لەسەرمان هەڵگرە محنەت و ئەلەم

ئیبراهیم گوتی ئەتو ئەی سکین
بۆ چ نابڕی چەرم و لە خوێن

سکین جوابیدا ئەمن مأموورم
ئەمری خوایە، کە هیچ نەبڕم

ئینجا ئیبراهیم کە ئاوڕی داوە
دیتی جوبرائیل لەوێ وەستاوە

بەرانی پێیە قەلەو و سەمین
ئیبراهیم لێتان بێ مزگین

خوا رەحمی کرد بەتۆ ئیسماعیل
بەرانی ناردووە خوای جەلیل

خوا فدیەی نارد بەرانی جنان
لەباتی ئیسماعیل بیکە بە قوربان

ئینجا ئیبراهیم کردی شوکری خوا
هەر بەبێ تأخیر ئیسماعیلی بەردا

خێرا کوشتییەوە بەرانی قەرنا
هەزار سەلاوات لەسەر محەممەد موستەفا

ئەم تەرجەمەی تاهیری فەقیر
بڵێ خودایە ئەتۆی دەستە گیر

یا رەب لێی خۆش بی بەخاتری ئیسماعیل
بەخاتری محەممەد موستەفا و ئیبراهیم خەلیل

لەرۆژی ئاخیر نەمانکەی زەلیل
لەقەبری تاریک هەر ئەتوی دەلیل

تۆ بمان بەخشە بە نەبی موختار
ئەمین محەممەد هەم ئالی ئەبرار

*****

١٩٧١/٥/٢

بابی مسکین و غەریبان یا محەممەد تۆی ئەمین
شافیعی مەحشەر محەممەد صاحبی دینی موبین
قبیلەکەت کەعبەی موکەرەم تۆی ئیمام المتقین
تۆی ئومێدی بێ ئومێدان هەم ئیمام المرسلین
شافیعی رۆژی سەرایە رەحمەتە بۆ عالەمین
ئەو کە هاتە سەر زەمین نورین بوو ئەقطاری سەما




یەك ئیشارەی کرد قەمەر شەق بوو دوو لەت لێك بوو جودا

دوو هەزار تەسریحی وەعزت چۆن نەبێتە مەوعیظا

قەسوەتی رەقتر لەبەردی لانەچێ ئەی طاهرا

نایەتە سەرتۆبە کردن قەلبەکەی پڕ قاروقین

ئومەتی سەیدی موختار خێرو خۆشی چاکەیە

زەنب و عیصیان هەر خەرابە دین نەبێ دونیا چییە

حووبی دونیا زیللەتە جەمعی هەموو هەر جیفەیە

ئومەتی پێغەمبەرێکم رەحمی ئەو وەك کەس نییە

طاهرا تۆبەی بکە ناهەش مەبە چاوت هەلێن

قافلەی پێغەمبەران هات تاکو ئیرشاد کەن عباد

بێن بیانکەن رێی هیدایەت تانەمێنێتن فەساد

هەرچی تەسدیقی نەکرد ماڵی وێران بوو بو کەساد

دۆزەخ و ئاگرو جەهەنەم فەرشن بۆ کافر میهاد

طاهرا شوکری خوداکە بۆی بە مۆمین ئەهلی دین

یەك نەفەس شوکرێ بکەی دوو سەد هەزار جاران کەمە

ئومەتی پێغەمبەرێکم گەورەیی ئەرزو سەما

ئاخیری چاکتر لە ئەوەل شاهید سورەی والضحی

جنة المأواية جێگەت لەیلی ئەسرا ئەحمەدا

هاتنە پێشوازیت هەموو حۆری و مەلەك بوون چین بەچین

**پەراوێز:**

١. چەند بەڵگەنامەیەکمان لا هەیە هێشتا بڵاومان نەکردۆتەوە.

٢. دانەیەك لە ئیرادەی مەلەکی لای نووسەری ئەم نووسینە هەیە.

٣. ئەمەم لە خودی زوهدی بیست کە لە دانیشتنێکدا بۆی گێرامەوە.

٤. زەر زور: رەشۆڵە، زەعرور: کێوژ ،

خدر: ناوی کەسێکە لەگەڵ خوشکەکەی لەنێو ماڵی مامۆستای گەورە کاریان دەکرد.

٥. ئەم پارچە شیعرە لە رەواندوز داناوە بێ دەستکاری کتو مت بڵاو دەکرێتەوە.
ئەمەش باسی پێغەمبەران ئیسماعیل و ئیبراهیم دەکات.





# شیعرو شاعیر
# له روانگەی ئیسلامەوە

**هێمن خۆشناو**

ئاینی پیرۆزی ئیسلام لەو کاتەی تیشکی زێرینی خۆی بەسەر ئەم جیهانەدا پەخش کرد. وەکو دەزانین ئاینێك هەبوو هەموو لایەنەکانی ژیانی گرتەوە. پەردەی لەسەر دڵ و دەروونی کۆمەڵدا هەڵدایەوەو، ژیرانە چارەسەرو دەرمانی بۆ داهێنا.

ئەدەب و هونەر بەگشتیو شیعر بەتایبەتی بەوە پێناسەکراوە کە دەربڕینێکە لەناو ناخ و دەروونی مرۆڤ هەڵدەقوڵێو ئاراستەی کونج و کۆڵانەکانی ژیان دەکرێت. جا بێگومان ئەگەر دەربڕینی پاك لە دەروونی جوان و پاکژدا هەڵقووڵێت ئەوا کوچەو کۆڵانەکانی ژیان پیسبن یان پاك جوانی بەخۆیانەوە دەبینن. بەڵام ئەگەر دەربڕینێك لە دڵ و دەروونێکی بۆگەنیو ژەنگاوی هەڵقووڵێت، ئەوا نەك هەر کوچەو کۆڵانی ژیان بۆگەن دەکات. بەڵکو (گوتراوە: هونەر ئاوێنەی ژیانە) ئاوێنەی ژیان ژەنگاوی دەکات و تارماییەکی رەش بەرچاوی بینەران دەگرێت.

بۆیە ئیسلامی پیرۆز لەو کاتەوە رووبەرووی ئەدەب و هونەر بەگشتی بووەوە کە شیعر رابەرایەتی دەکرد. ئەوکات سەردەم سەردەمی شیعرو هۆنراوە بوو. بالای شیعر گەیشتبووە بالایەکی بەرز بەجۆرێ هەر هۆزەو شاعیری تایبەتی خۆی هەبوو کە پلەو پایەیەکی تایبەتیو گەورەی هەبوو لەناو هۆزدا. بۆ ئەوەی بەشیعر هەرەشە لە دوژمنی خۆی بکا. چونکە شیعر فەلسەفەی زمانە، هەر لایەنە و دەیەویست شاعیرێکی بلیمەتی لێهاتوو بۆ خۆی بەدەست بێنێ. لەم کاتەدا پێویستی سەرشانی ئیسلام بوو کە چارەسەری ئەم رق و کینەوە ملمڵانێیە ژەنگاوییە بکات، هەر وەك چۆن چارەسەری بۆ هەموو بوارەکانی تری ژیان دۆزییەوە. بابەیەکەوە چەند ساتێك لە خزمەتی ژیانی پێغەمبەرو هاوەڵانی دابین و بزانین ئاینی پیرۆزی ئیسلام چۆن باس لە شیعر دەکات و حوکمی ئیسلام بۆ شیعرو شاعیر چییە. کاتێك پێغەمبەر (د.خ) دەستی کرد بەبانگەوازی کردن بۆ ئیسلام و قورئانی پیرۆزی بۆ دابەزی. بتپەرست و بێ بڕواکانی مەککە سەرسام مان لە قورئانی پیرۆزو پێغەمبەر(د.خ). بۆیە جارێك بە تەپڵ لێدانی محەممەد شێت و کاهین و شاعیرو جارێك بەتەپڵ لێدانی محەممەد شاعیرە، بەڵام قورئانەکەی شیعر نییە، دژایەتی پێغەمبەرو ئاینەکەو هاوەڵانیان دەکرد. خوای گەورە بە ئایەتی پیرۆز هاوبەشدەرەکانی بەدرۆ خستەوە کە فەرمووی: ﴿**وَمَا عَلَّمْنَاهُ الشِّعْرَ وَمَا يَنْبَغِي لَهُ**/ سورة يس-٦٩﴾.

لەلایەکی ترەوە ئاپۆرای خەڵك لە زۆریدا بوو، کە موسڵمان بوونی خۆیان رادەگەیاند، لەنێوان




ئەمانەشدا تاك تاك شاعیران دەبینران. بەم جۆرە شاعیران بوون بە دوو بەش: بەشێکیان بوون بە موسڵمان و بڕوایان هێناو شیعرەکانیان بۆ خزمەتی ئیسلام دەهۆنییەوەو بەشەکەی تریان دژی ئیسلام وەستان و شیعرەکانیان دەکردە چەکێك بۆ بەرەنگاربوونەوەی محەممەد(د.خ)و ئایینەکەی.

شاعیرانی پێغەمبەر (د.خ) ژمارەیان سێ شاعیر بوو، کە لە یارمەتیدەرەکان (الانصار)بوون کە بریتی بوون لە حەسانی کوڕی سابیت و کەعبی کوڕی مالیك و عەبدوڵلای کوڕی رەواحە. ئەمانە نوێنەرایەتی سێ شاعیری گەورەی قورەشیان دەکرد کە عەبدوڵلای کوڕی زوبەعریو ئەبی سوفیانی کوڕی حارس و هەبیرەی کوڕی وەهەب بوون. هەروەها شاعیرە ئافرەتە موسڵمانەکانیش رۆڵێکی کاریگەریان هەبوو لەم جەنگە شیعریانە وەك: مەیمونەی کچی عەبدوڵلاو سەفیەی کچی عەبدولموتەلیب.

خوای پەروەردگار لە ئایەتێکدا هەڕەشەیەکی گەورە لە شاعیرە بێ باوەڕەکان دەکات و لە شاعیرانی موسڵمان جیاوازیان دەکاتەوەو دەفەرمووێ: ﴿**وَالشُّعَرَاءُ يَتَّبِعُهُمُ الْغَاوُونَ* أَلَمْ تَرَى أَنَّهُمْ فِي كُلِّ وَادٍ يَهِيمُونَ* وَأَنَّهُمْ يَقُولُونَ مَا لاَ يَفْعَلُونَ* إِلاَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَذَكَرُوا اللَّهَ كَثِيرًا وَانتَصَرُوا مِنْ بَعْدِ مَا ظُلِمُوا**/ سورة الشعراء-٢٢٤-٢٢٥-٢٢٦-٢٢٧﴾

قورئانی پیرۆز دژایەتی شیعری نەکردووە (وەك هەندێك کەس بۆی دەچن)، بەڵکو دژایەتی ئەو بەرنامەیەی دەکرد کە هەندێك لە شاعیرەکان گرتبوویانە بەر. هەروەها قورئانی پیرۆز هەر بەوەوە نەوەستا، بەڵکو شاعیرەکانی لەیەکتر جیاواز کردەوەو کردنی بەدوو بەش ئەوانەی دژایەتی راستیو قورئان و ئیسلام دەکەن و ئەوانەش بەهۆی بیری جوانەوە ئاراستەی شیعرەکانیان بۆ کاری چاك و داکۆکی لە حەق و راستییە.

## هەڵوێستی پێغەمبەر (د.خ) بەرامبەر شیعرو شاعیر

شیعر چەکێکی دوو سەرە، بۆیە پێغەمبەر (د.خ) دەفەرموێت: (انما الشعر كلام فمن الكلام خبيث وطيب) یان فەرمووێ: (ان من الشعر حكمة)-رواه البخاري- واتە: شیعر یا هاوڕایە لەگەڵ راستیو راستگۆییدا یا هاوڕایە لەگەڵ چەوتیو نەفامیدا.

هەروەها پێغەمبەر (د.خ) باس لە رەنگە دیاریکراوەکانی شیعرو بابەتە تایبەتییەکانی دەکات کە دژی ئایین و کۆسپی بەردەم بانگەوازی ئیسلامن. کە شاعیرە بێ باوەڕەکانی قورەیش لەم جۆرە بوون. کە دەفەرمووێ: (لئن يمتلئ جوف احدكم قيحاً ودماً خير من أن يمتلئ شعراً) (رواه مسلم) وەنەبێ مەبەستی پێغەمبەری خودا (د.خ) لەم فەرموودەیەدا شاعیرانی موسڵمان بێت، بەڵکو هەر ئەو پێغەمبەرەیە (د.خ) لە مزگەوتەکەی خۆیدا دوانگەیەکی بۆ حەسسانی کوڕی سابیت دروستکرد، بۆ ئەوەی حەسسان لەسەریدا بوەستێو شیعری جوان بڵێ. (عن عائشة(ر.ض) قالت: كان النبي (ص) يضع لحسان منبرا في المسجد يقوم عليه قائما يفاخر أو ينافح عن الرسول لله)-رواه ابوداود والترمذي- ئایا پێغەمبەر (د.خ) نەیفەرموو بە حەسسان لە جیاتی من، تۆ بەرپەرچی تانەو تەشەری بێ بڕواکان بدەرەوە، کە پێی فەرمووی: (اللهم ايده بروح القدس) (رواه البخاري) خوایە بەهۆی جبریلەوە پشتیوانی بکە.

ئەی عائیشە (خوا لێی رازی بێت) نەی گێڕاوەتەوە کە پێغەمبەر فەرمووی: هەجووی قورەیش بکەن، چونکە لە تیرەباران چاکتر کاریان لێدەکات، ئینجا پێغەمبەر(د.خ) ناردی بۆ لای عەبدوڵلای کوڕی رەواحە کە هەجوویان بکات. فەرمووی پێی هەجوویان بکا، ئەویش هەجووی کردن، بەڵام بەدڵیان نەبوو، بۆیە ناردی بۆ لای کەعبی کوڕی مالیك ئەویش وا. پاشان ناردی




بەشوێن حەسساندا کە هاتە خزمەتی گوتی ناخێری ناردتان بەشوێن شێرە گەورەدا ئینجا گوتی: بەو کەسەی کە تۆی کردووە بە پێغەمبەر وەك کەولە شڕ بەشیعرو هەڵبەست شڕو وریان دەکەم، پێغەمبەر (د.خ) فەرمووی: هێواش پەلەمەکە، هەتا ئەبوبەکر رشتەو رەسەنی منت بۆ دیارنەکات، چونکە بنەچەم لەوانە، پاشان حەسسان چووە لای پێغەمبەرو فەرمووی: ئەبوبەکر بەجوانی رشتەی رەسەنی تۆی بۆ دیارکردم. بەو خوایەی کە تۆی کردووە بە پێغەمبەر وەك چۆن تەڵەموو ساغ و پاك لە هەویر دەردەکێشرێ، ئاوا تۆیان لێ جیا دەکەمەوە. پێغەمبەریش (د.خ) فەرمووی: تۆ لەسەر خواو پێغەمبەری خواو بکەیتەوە هەمیشە جوبرائیل دەست دەگرێ بەپشتت و خوا پشتیوانتە، ئینجا حەسسان بە شیعرە جوانەکەی دەستی پێکرد: هجوت محمداً فأجبت عنه . عائیشە فەرمووی بەگوێی خۆم گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا(د.خ) فەرمووی: حەسسان شڕ و وری کردن و داخی دڵی خۆیو موسڵمانانی پێ رشتن-موسلیم و بوخاری گێراویانەتەوە-.

کەعبی کوڕی مالیك لەکاتی دابەزینی ئایەتی ﴿وَالشُّعَرَاءُ يَتَّبِعُهُمُ الْغَاوُونَ/ سورة الشعراء-٢٢٤﴾دا پرسیاری لەبارەی شیعر لە پێغەمبەری خوا کرد. پێغەمبەر (د.خ) فەرمووی: (أن المجاهد بسيفه ولسانه والذي نفسي بيده ترمونه به نضح النبل) واتە: موجاهید بەشمشێرو زمانی جیهاد دەکات، بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە شیعر بارانتان کردن وەکو ئەوەی تیربارانیان کردن.

هەروەها جابر دەگێڕێتەوە پێغەمبەر(د.خ) بە کەعبی کوڕی مالیکی فەرموو: (**مانسي ربك وماكان ربك نسيا،بيتا قلته**) خوا تۆی لەیاد نەکردووەو سوپاسی کردوویت بۆ ئەم شیعرەی کە گوتووتە، خواش شت لەیاد ناکا، گوتی ئەم شیعرە چییە؟ فەرمووی ئەی ئەبوبەکر بۆی بخوێنەوە ئەویش گوتی:

**زعمت سخينة ان ستغلب ربها**

**وليقلين مغالب الغلاب**

واتە: هەر کەس جەنگ لەگەڵ خوا بکات بەراستی شکاوەو بەرەو پاش دەگەڕێتەوە. جێگای باسە شیعرەکانی کەعب زۆر کاریان کردە سەر دڵی بێ بڕواکان. ئەوەتا (ئیبن سیرین) دەڵێت: کەعب دوو دێرە شیعری گوت بووە هۆی موسڵمان بوونی (دەوس). هەروەها عەبدوڵڵای کوڕی رەواحە ئەو شاعیرەبوو کە پرسیاری لە عائیشە کرا ئایا پێغەمبەر (د.خ) نموونەی بەچ شتێ لە شیعر دەهێناوە؟ فەرمووی: (كان يتمثل بشعر أبن رواحة) نموونەی بەشیعری عەبدوڵڵای کوڕی رەواحە دەهێنایەوە هەواڵێکت دەداتێ کە داوات نەکردبێت.

هەروەها جوانترین وتە کە شاعیر گوتوویە بەلای پێغەمبەری خوا(د.خ) قسەی لەبیدە کە دەڵێ: (**ألا كل شئ ما خلا الله باطل، وكل نعيم لا محالة زائل**) کە بەم وتەیە خەریك بوو ئومەییەی کوڕی سەلت کە شاعیرێکی گەورەی قورەیش بوو شیعرەکانی لەبابەتی یەکتاپەرستی بوون موسڵمان ببێت.

کەعبی کوڕی زوهەیریش یەکێك بوو لەو شاعیرانەی دژایەتی ئیسلامیان دەکرد، بەڵام پاش ئەوەی خوای پەروەردگار هیدایەتیدا هات موسڵمان بێت بە هەڵبەستە بەناوبانگەکەی (**بانت سعاد فقلبي اليوم متبول**) داوای لێبوردنی لە خواو لە پێغەمبەرەکەی کرد، پێغەمبەریش (د.خ) داوای لێبووردنی لە خوا بۆ کرد. جابری کوڕی سەموره دەڵێت زیاتر لە سەدجار لەخزمەت پێغەمبەر دانیشتووم، هاوەڵەکان هۆنراوەی راستیان دەگوت کە هەجوی بت پەرستەکانیان دەکرد، پێغەمبەر(د.خ) بێ دەنگ دەبوو، جاری واش هەبوو پێدەکەنی- ترمزی گێراویەتییەوە-.

هەروەها عەمروی کوڕی شرید لەباوکی خۆی دەگێڕێتەوە کە رۆژێکیان لە پشت پێغەمبەری خواوە سواری ولاغێك بووم. فەرمووی پێم ئایا




شتێکت لە شیعری ئومەییەی کوڕی سەلتت لا نییە، گوتم بەڵێ، فەرمووی بۆمی بڵێ، منیش بەیتێکم بۆ وت پاشان وتی هێشتا بڵێ، منیش (١٠٠) بەیتم بۆ وت- موسلیم گێڕاویەتییەوە-

ئەم فەرموودەیە ئەوە دەسەلمێنێ ئەگەر شیعرێك باس لە یەکتاپەرستیو شتی چاکە بکات ئەگەر خاوەنەکەشی موسڵمان نەبێت. ئەوا ئیسلام دژایەتی شیعرەکەی ناکات. هەروەها ئەوەش دەسەلمێنێ کە شیعر لەفەرموودەکانی پێغەمبەر(د.خ) هەر سێ جۆرەکەی (قولی- فعلی- تقریری) دەگرێتەوە، هەرچەندە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمَا عَلَّمْنَاهُ الشِّعْرَ وَمَا يَنْبَغِي لَهُ/ سورة الشعراء-٦٩﴾ ئێمە پێغەمبەرمان فێری شیعر نەکردووە..

بەڵام جوندبی کوڕی عەبدوڵلا فەرمووی جارێکیان بەهۆی بەردەوە پەنجەی پێغەمبەری خوا خوێنی لێهات، بۆیە پێغەمبەر (د.خ) فەرمووی: (هل انت الا اصبع دميت، وفي سبيل الله مالقيت) هەروەها لە رۆژی حونەین فەرمووی: (**انا النبي لاكذب، انا ابن عبدالمطلب**)لە رووی کێش و سەرواوە لە شیعر دەچێ بەڵام ئەم دەگمەنییە نایەتە رێزی شیعرەوە، بۆیە پێغەمبەر (د.خ) شیعری تەواوی نەبووە.

## حوکمی شیعر لە ئیسلامدا

ئیسلامی پیرۆز دژایەتی شیعر ناکاو، کۆڕی زانایان لەسەر ئەوە کۆکن کە شیعر چەند قسەیەکە لە رستە قسەیەك، ئەگەر داوای سەرکەوتن بۆ ئەو کۆمەڵگەیە بکات کە تیایدا دەژیو باسی چاکەو نیعمەتەکانی خوای گەورەبکات و چارەسەر بۆ کەم و کورییەکانی دەوروبەری دەربخات، بەم جۆرە ئیسلام دژی شیعر نییەو، بەڵکو لەوانەیە پاداشتێکی زۆریشی لای خوا بۆ بنووسرێ.

بەڵام ئەگەر بەپێچەوانەوە بوو بەر ئایەتی ﴿وَالشُّعَرَاءُ يَتَّبِعُهُمُ الْغَاوُونَ/ سورة الشعراء-٢٢٤﴾ دەکەون، ئەوا ئیسلامی پیرۆز لێی بەریەو لەگەڵیدا نییە.بەکورتی (چاك و پاکی شیعرەکە چاکی دیاردەخاو، چاکە، خراپ و پیسیو ناپاکی شیعرەکە خراپی دیاردەخاو، خراپە).

## گەلی کورد لە کاروانی شیعرو شاعیراندا

گەلی کورد وەکو گەلێکی چەوساوەی موسڵمانی پابەند بە بەرنامەی خواوە، شیعر لای دیرۆکێکی مەزنی هەیە، بەتایبەتی زانایان و قوتابیانی قورئانی پیرۆز کە هەندێکیان بەنموونەی شاعیرانی موسڵمان لە جیهانی ئیسلام دادەندرێن.

هەر لە نالیو بابەتاهیر و جزیریو خانیو مەولەویو مەحویو حاجیو فەقێی تەیران و هتد دەیان و بگرە سەدانی تریش شیعرەکانیان کردۆتە قەڵغان بۆ بەرگری کردن لە ئیسلام و لە خاکە پیرۆزەکەیان و خۆشەویستی پێغەمبەریان بە چەندەها هەڵبەست و دێر دەربڕیووە، شاعیرەکانی خۆیان بەشانازییەوە بە شاعیری پێغەمبەر (د.خ) حەسسانی کوڕی سابیت بەراورد دەکەن، وەك نموونەی حاجی قادری کۆیی دەڵێت:

**دوو عەلین شاعیر وەکو حەسسان**
**بەردەشانیو حەریرە مەسکەنیان**

کە مەبەستی عەلی حەریریو عەلی بەردەشانییە، کە دوو شاعیری کوردن.


**سەرچاوەکان:**

١. التاج الجامع للاصول في احاديث الرسول (منصور علي ناصف) (٥,٣).
٢. الجدول في اعراب القران (محمود صافي) جزء (١٩,٢٤).
٣. داستانی یاوەران (٥).




# ڕۆڵی ئیسلام لە پتەوکردنی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان

نەوزاد کەلهور

پەیوەندی کۆمەلایەتی بەگرنگترین بەهای کۆمەڵایەتی دادەندرێت لەنێو هەموو کۆمەڵێکدا. ئەمانی ئەو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییە دەبێتە هۆی هەڵوەشانەوەو پچڕانی شیرازەی کۆمەڵ و داتەپینی شارستانیەتی ئەو کۆمەڵە. هەروەکو زۆر لە گەلانی دونیا ڕۆڵی بەرچاویان لەنێو میللەتاندا بینیووە، بەڵام بەنەمان و لەناوچوونی پەیوەندییە کۆمەلایەتییەکان چرای شارستانییەتیان کوژاوەتەوەو ئاسەواریان سڕاوەتەوە. ئەوەی جێگای دڵخۆشی و شانازییە ئەوە پەیوەندی بەها کۆمەلایەتیانە لەناو میللەتی موسڵماندا پارێزراوە، کەبۆتە هۆکارێکی گرنگ بۆ یەکگرتن و یەك ڕیزی میللەتەکەمان و مانەوەی شارستانیەتی ئیسلام لەسەر شانۆی ژیان، خۆشبەختانە ئەو پەیوەندییە کۆمەڵایەتیانەو ئەو داب و نەریتانە، وەکو سەردانی یەکترو، ڕێزگرتنی یەکتری و، لەیەکتری پرسین و، یارمەتیدانی لێ قەوماوان و، پرسەدانان بۆ مردوو و دڵنەوایی خاوەنەکەی کە زۆر پێویستە بۆ باری دەروونی، هەروەها لە نەخۆش پرسین و سەردانی کردنی بۆ گەڕانەوەی متمانەی بەخۆی، گەڕانەوەی هێزی دەروونی نەخۆشەکە، خزمەتکردنی دایك و باوك و پرس پێکردنیان بۆ ئەوەی بزانن پشتگوێ نەخراون و ماندووبوونیان بەفیڕۆ نەچووە، پاشان ڕێزگرتنی دراوسێ و میوان، کە ئەمانە هەمووی ڕەوشتی بەرزی ئایینی ئیسلامن و سەرچاوەیان لە قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر(د.خ) وەرگرتووە، خوای گەورە لە قورئاندا دەربارەی خزمەتکردنی دایك دەفەرموویت:﴿ **وَقَضَى رَبُّكَ أَلاَّ تَعْبُدُوا إلاَّ إيَّاهُ وَبِالْوَالِدَيْنِ إحْسَانًا إمَّا يَبْلُغَنَّ عِنْدَكَ الْكِبَرَ أَحَدُهُمَا أَوْ كِلاَهُمَا فَلاَ تَقُلْ لَهُمَا أُفٍّ**/ سورة الاسراء-٢٣ ﴾ خزمەتکردنی دایك و باوك یەکێکە لەو پێوەندییە بەهێزو پتەوەی کەبۆ مانەوەی کۆمەڵ پێویستە، بەپێچەوانەی شارستانییەتی ڕۆژئاوا، کاتێك دایك و پیرو پەککەوتە دەبن، شەوان لەکۆڵانان و سەر شەقامەکان شەودەکەنەوە. لەپاش دایك و باوك باسی خزم و خۆیش دەکا لەگەڵ داماوان، کە ئەو کەسانەی خاوەن ڕشتەی خزمایەتین لەگەڵتاندا﴿**وَآتِ ذَا الْقُرْبَى حَقَّهُ وَالْمِسْكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ وَلاَ تُبَذِّرْ تَبْذِيرًا**/ سورة




الاســـــراء-٢٦﴾ دانايـــــان بەناونيشانی (الانسان الكامل) دايانناون تەفسيری نامی بەرگی چوارەم لاپەڕە (٥٨٢).

ڕێزگرتنی میوان و دروساسێ کە ئەمانەش دوو فاکتەری سەرەکین بۆ پتەوکردنی پەیوەندی کۆمەڵایەتی، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿**وَالْجَارِ ذِي الْقُرْبَى وَالْجَارِ الْجُنُبِ وَالصَّاحِبِ بِالْجَنْبِ وَابْنِ السَّبِيلِ وَمَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ** / سورة النساء-٣٦﴾

ئیمامی بوخاری گێڕاویەتییەوە لە پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی: (**والله لايؤمن والله لايؤمن والله لايؤمن قيل يارسول الله من؟ قال الذي لايأمن جاره بوائقه**) تەفسیری نامی بەرگی دووەم لاپەڕە (٣١٥).

دیسان پێغەمبەر (د.خ) هەر دەربارەی ڕێزگرتنی دراوسێ و میوان دەفەرمووێت: (**من كان يؤمن بالله واليوم الاخر فليكرم جاره ومن كان يؤمن بالله واليوم الاخر فليكرم ضيفه**) لەپاشان سەردانی یەکتری و لەیەکتر پرسین، کە ئەمەش هۆکارێکی ترە بۆ پەیوەندی کۆمەڵایەتی و پەیداکردنی خۆشەویستی لەنێوان ئەندامانی کۆمەڵدا: ﴿**فَإِذَا دَخَلْتُمْ بُيُوتًا فَسَلِّمُوا عَلَى أَنفُسِكُمْ تَحِيَّةً مِنْ عِنْدِ اللَّهِ مُبَارَكَةً طَيِّبَةً**/ سورة النور-٦١﴾.

پێغەمبەر (د.خ) دەربارەی سلاو لەیەکتری کردن و ناندانی خەڵکی و سەردانی خزم ودۆست و برادەر، دەفەرمووێت: (**ياايها الناس افشوا السلام واطعموا الطعام وصلوا الارحام وصلوا والناس نيام فدخلوا الجنة بالسلام**) - قران الكريم تفسير والبيان اسباب النزول للسيوطي- لاپەڕە ٣٥٨ لە شوێنێکی تردا پێغەمبەر (د.خ) فەرمانمان پێ دەکات بە حەوت شت کە هەموویان زۆر کاریگەرن بۆ بەردەوامی و مسۆگەرکردنی ڕەگ و ڕیشەی کۆمەڵ، لەهەمان کاتیشدا پەیوەندی کۆمەڵایەتی بەهێز دەکا: (**عن البراء (ر.ض) قال امرنا النبي (ص) بسبع ونهانا عن سبع امرنا بأتباع الجنائز وعيادة المريض واجابة الداعي ونصر المظلوم وابرار القسم ورد السلام وتشميت العاطس ونهانا عن انية الفضة وخاتم الذهب والحرير والديباج والقسي والاستبرق وركوب المياثر**) (اقران النيرين في مجمع البحرين) بەرگی ٧ لاپەڕە ٢٧٢.

ئەمانەو جگە لە ئەنجامدانی چەند کارێکی کۆمەڵایەتی وەك ئاشتبوونەوە لەگەڵ یەکتردا، سەردانی یەکتر لەکاتی جەژنەکاندا، بەشداربوون لەهەندێك بۆنە، کە بەڵگەن لەسەر یەکریزی هاوولاتیان و بەتەنگەوە هاتنی یەکتری و پەیدابوونی تەبایی و ئاسوودەیی لەنێو کۆمەڵداو پاراستنی شیرازەی کۆمەڵگە.


## سەرچاوەکان

١. قورئانی پیرۆز

٢. فەرموودەکانی پێغەمبەر (د.خ)

٣. علم النفس الاجتماعي، حامد عبدالسلام زهران.





## له ڕێكخستنی ڕێورەسمی پرسەدا..

# پێویستە ڕەچاوی هەستی خاوەن مردوو و باری ئابووری بكرێت

ڕاپۆرت: سامان محەممەد بەشارەتی

ماوەیەك لەمەو پێش وەزارەتی ئەوقاف و كاروباری ئیسلامی بەپشت بەستن بەگفتوگۆو لێكۆڵینەوەیەكی دوورو درێژ لەگەڵ زانایانی ئایینی ئیسلامی كوردستان لە لیژنەی پسپۆرو كەسانی شارەزاو مەكتەبی كۆمەڵایەتی و كەسانی پەیوەندیدار بڕیاریدا كە مەراسیمی پرسە لەدوای نیوەڕۆیانەوە دابندرێت بۆ ماوەی سێ ڕۆژ و پیاوان لە مزگەوت دابنیشتن، پێشتریش بڕیاری ئەوە دەركرابوو كەنابێ لە پرسەكاندا جگەرەو چاو قاوەو شتی تر پێشكەش بكرێت، ئەم بڕیارانە تا ڕادەیەكی باش لەلایەن مزگەوتەكان و لەلای خەڵكانی ڕۆشنبیرو زۆربەی هەرە زۆری كوردستان و خاوەن پرسەكە جێبەجێ كراوە.

بەڵام ئەوەی جێگای داخە ئێستا دیاردەیەك ماوە، ئەویش سەردانی ماڵی خاوەن پرسەیە سەر لەبەیانیان بەتایبەتیش گوند نشینەكان و ئافرەتان كە پێدەچێت تاكو ئێستاش هەر لەسەر نەریتی پێشوو بەردەوامن و بەڕۆیشتنە سەر ماڵی خاوەن پرسە ئەركێكی قورس دەخاتە سەر خاوەن پرسەكەو لەلای هەندێك ئافرەتیش وایە كە ئەو بڕیارەی وەزارەتی ئەوقاف تەنها بۆ پیاوان و بۆ كارمەندانی حكومەتە، بەڵام لە ڕاستیدا بۆ سەرجەم چین و توێژو ڕەگەزەكانەو پەیوەست بوون بەو بڕیارەوە لەبەرژەوەندی گشتی خەڵكی كوردستانە، لەلایەك باری دەروونی خاوەن مردوو ڕەچاودەكرێت و لەلایەكی تریشەوە ئەرك و مەسرەفی زیادەی لەسەر لادەچێت بۆ زیاتر هۆشیاركردنەوەی خەڵكی كوردستان، بەتایبەتیش ئەوانەی تا ئێستا سەرلەبەیانی دەچنە سەر ماڵی خاوەن پرسە بۆ سەرەخۆشی لێكردن، لەم بارەیەوە ڕاوبۆچوونی چەند كەسێكمان وەرگرت:-

**١.ماموستا مەلا جەرجیس ئیبراهیم:**

بەناوی خوای گەورە، بەراستی ئەو بڕیارەی كە وەزارەتی ئەوقاف و كاروباری ئیسلامی دەری كردووە، بڕیارێكی زۆر بەسوودە لەبەر ئەوەی بەرژەوەندی خاوەن مردووی تێدایە بەتایبەتی لە ڕۆژانی هاویندا خاوەن پرسەكە لەبەیانی تائێوارە دادەنیشێت ماندوو بێزار دەبێت. زۆر خاوەن مردوومان بینیووە دوای





پرسەکەی لەئەنجامی وەستانی سێ رۆژی پرسەکە نەخۆش کەوتووە، لەهەموو پارێزگاکان هەموو پرسەیەك دانی ئێوارانە تەنها لە هەولێر نەبێت. بەو بڕیارەی کە وەزارەتی ئەوقاف دەری کردووە ئەگەر هەولێریش جێبەجێی بکات زۆر چاکە. لەبەر ئەوەی خەرجی بەیانیانی لەسەر کەم دەبێتەوە. زۆر لە خاوەن پرسەکان هەن کەم دەستن و بۆ بەڕێوەبردنی پرسەکانیان تووشی قەرز کردن دەبن. ئەگەر خەڵك دانی ئێواران بچن بۆ پرسە باشترە، زۆربەی خەڵکی لە دام و دەزگاکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان کارمەندن. بۆیە لەکاتی چوونیان بۆ پرسە، دەبێت ئیش و کارەکانیان بەجێبهێڵن، ئەمەش دەبێتە هۆی دواکەوتنی زۆربەی ئیش و کارەکانی خەڵك. بەڵام ئێستا ئەوە نەماوەو کارمەندان دەوامی خۆیان دەکەن و دوای دەوام واتە ئێواران دەچن بۆ پرسەو سەرەخۆشی خاوەن مردوو. لەبەر ئەوە ئێستاکە باشتر ئیش و کارەکانی خەڵك بەڕێوە دەچێت.

جەنابی مامۆستای پایە بەرز عەبدوڵڵا نەقشبەندی بەخۆی داوای کرد لە دوای مردنی پرسەی بۆ دانەندرێت، لەبەر ئەوەی ئەرکی پرسە گرانە لەسەر خەڵك، بۆیە جێبەجێ کردنی ئەم بڕیارە کارێکی بەسوودە.

**هەروەها خاتوو سوعاد سالح دەڵێت:**

بەراستی بڕیارێکی زۆر باشە ئەگەر بەتەواوی جێبەجێ بکرێت، خاوەن پرسەش خەرجێکی کەمتر دەکات، چونکە هاتووچۆ کەمتر دەبێت، هیوادارم هەموو ئافرەتان لەمەودوا پابەندی ئەم بڕیارەی وەزارەتی ئەوقاف بن بۆ ئەوەی پرسە بەباشترین شێوە بەڕێوە بچێت.

**هەروەها خاتوو پاکیزە شەمسەددین دەڵێت:**

بڕیارێکی زۆر باشە ئەگەر تێکڕای خەڵك جێبەجێی بکەن، چونکە خاوەن پرسە ئەرکێکی کەمتری دەکەوێتە سەرشان خەڵکی واهەیە لەکاتی چوونی بۆ پرسە لە بەیانییەوە تاوەکو ئێوارە دادەنیشێت لەماڵی خاوەن پرسە، بێ ئەوەی رەچاوی بەرژەوەندی خاوەن پرسەکە بکات ئەگەر دانی بەیانیان نەمێنێت دەبێتە پشوویێك بۆ خاوەن پرسەکە، چونکە وەستانی پرسە لەبەیانییەوە تا ئێوارە خاوەن پرسە زۆر ماندوو دەکات. بۆیە ئەم بڕیارە سوودێکی زۆری مادیو مەعنەوی بۆ خاوەن پرسە هەیە.

**هاووڵاتی سلێمان ئیبراهیم دەڵێت:**

ئەو بڕیارەی وەزارەتی ئەوقاف بڕیارێکی شایستەو بەجێیە سەبارەت بە دانانی سنوورێك بۆ چوارچێوە کردنی مەراسیمی پرسە کە هاووڵاتیان پەیڕەوی بکەن، ئەویش بەرێکخستنی کاتەکانی ژیانی هاووڵاتیان بۆ کارو کاتی پرسەو سەرەخۆشی، ئەویش بەوەی کە دانیشتنی پرسە تەنها دانی ئێواران بێت بۆ دڵنەوایی خاوەن پرسەکە.

**خاتوو پەخشان عەزیز دەڵێت:**

ئەو بڕیارەی کە دەرچووە پرسە دوای نیوەڕۆیان بێت، تەنها بۆ مزگەوتەکان نییە، بەڵکو بۆ ماڵەکانیشە بەتایبەتی بۆ ئافرەتان پابەندی ئەم بڕیارە بن بۆ ئەوەی ئەرکی قورس نەکەوێتە سەر خاوەن پرسە.

**کامەران ئەحمەد وتی:**

من لەلایەن خۆمەوە ئەو بڕیارەی وەزارەتی ئەوقاف بەشتێکی باش دەزانم، لەبەر ئەوەی تا رادەیەك دەتوانێت لەبواری ئابووری خاوەن پرسەکە تووشی زیانی زۆر نەکات، لەبارەی دەروونیشەوە ئێش و ئازار لە دڵ و دەروونی خاوەن پرسەکە کەم دەکاتەوە.





# دوانە لە کەلەپووری ئیسلامیەوە

هیوا عومەر ئەحمەد

یەکێك لە بەخششەکانی خوای گەورە بەمرۆڤی داوە لەش ساغی و کەم و کورتی نەبوونە لەژیاندا، چونکە تا مرۆڤ تووشی نەخۆشی و کەم و کورتی عەقلی و جەستەیی نەبێت قەدرو رێزی ساغی نازانێت. جا زۆر جار خوای گەورە مرۆڤی وا دروست دەکات کە کەم و کوڕی هەبێت لەلایەنی جەستەی و عەقلی یان هەر لایەنێکی تر بۆ ئەوەی مرۆڤە ساغەکان قەدرو رێزی ساغی خۆیان بزانن، بزانن کە خوای گەورە توانای هەیە مرۆڤ بەم شێوەیە دروست بکاو مرۆڤی ساغ نەخۆش بکاو مرۆڤی نەخۆشیش چاك بکاتەوە، تا بیر بکەنەوە کاتەکانی ساغی زۆر رێز لێبگرن، جا ئێمە لێرەدا مەبەستمان دروستبوونی جمکەیە (دوانە-التوائم)، کە زۆر جار بەشێوەیەکی وا دروست دەبێ کە بەیەکەوە نووساوە. دەبێتە هۆی دەردە سەری بۆ هەردوو منداڵەکەو خۆشی و ناخۆشیان لەگەڵ یەکتردایە. دروستبوونی منداڵ دەگەڕێتەوە بۆ یەککگرتنی تۆی پیاو لەگەڵ هێلکۆکەیەکی پێگەیشتووی هێلکەدانی ئافرەت، کە بەرەبەرە گەشە دەکات کۆرپەلەیەك دروست دەبێت، بەڵام دروست بوونی دوانە (جمکە) دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە گۆڕان لە هێلکۆکەکانی پیتراو (البویضات المزجیة) ڕوودەدات، یان دەگەڕێتەوە بۆ دووکەرت بوونی هێلکەی پیتراو. دروستبوونی دوانە (التوائم) دەکرێتە سێ بەشی سەرەکی:

١. دوانەی لەیەك نەچوو (التوائم غیر المتشابه) ئەوەش بەهۆی پیتێنی دوو هێلکۆکە یان زیاتر کە ئافرەت دەیرژێنێ ڕوودەدات، کە هەر هێلکۆکەیەك بە تۆوێك (حیوان منوي) دەپیتێندرێ. ئەو دوو بۆهیلانە بەرە بەرە گەشە دەکەن تا لە دایك بوونی دوو منداڵەکە، ئەو دوو منداڵە بەتەواوی بەیەك ناچن تەنها بە ئەندازەی ئەو بەیەکچوونەی کە منداڵەکان لە باوك و دایکیان دەگرن.

٢. دوانەی بەیەکچوو (التوائم المتطابقة-المتشابه): ئەوەش لە ئەنجامی پیتێنی یەك هێلکۆکە بەیەك تۆو لە قۆناخی دووکەرت بوون یان لەدوای دووکەرت بوون خانەکان لێکجیادەبنەوە ڕوودەدات، بەشێوەیەك کە هەریەکێك کۆرپەیەکی تەواوی لێ دروست دەبێ. ئەم دوو کۆرپەیە زۆر لێك دەچن تەنانەت ئەگەر زۆر لەگەڵیان نەژیابی یان نیشانەیەکت بۆ دانەنابن ناتوانی لێکیان جیا بکەیتەوە، ئەوەش توانای خوای پەروەردگار دەردەخا کە هەتا ئێستا هۆی ئەم دووکەرت بوونە نەزاندراوە. هەندێك لە زانایان وای بۆ دەچن کە دەگەڕێتەوە بۆ تێکچوونی کاری هۆرمۆنەکان یان دەڵێن دەگەڕێتەوە بۆ مەیلی بۆماوەیی (میل الوراثي) بۆ دابەش بوون و دووکەرت بوون لەکاتی هێلکۆکەدا.

٣. دوانەی بەیەکەوە نووساو(التوائم الملتصقة): ئەو دوانەیە جۆرێکە لە دوانەی لەیەکچوو بەڵام دابەش بوونی





هێلکۆکەی پیتراو بەتەواوی نابێ، ئەوەش دەبێتە هۆی لە دایك بوونی دوانەیەکی بەیەکەوە نووساو (Conjoined Twins) ئەو دوو دانەیە ناسراوە بە ناوی (السیامیە) چونکە ئەو حاڵەتانە لە سەدەی نوێدا بۆ دوانەکانی سیام (تایلەندی ئێستا) بەکار هاتووە، ئەو بەیەکەوە نووسانە یان لەسەرەوە بوو (Cranio pagus) یان لە سنگ وبەشی پێشەوە (Thoraco pagus) یان لە پشتەوەبوو (pyopagus). لە کۆنەوە جۆرە بیروڕایەکیان هەبوو بۆ دروست بوونی دوانە لەوانە یۆنانییەکان لەباری توێژینەوەو لێکۆڵینەوەی بۆ هێلەکان (جینات)و ڕۆژئاواییەکانیش ئەم بیروڕایەیان هەبووە تا پاش داهێنانی وردبین (mycroscope) بە نزیکەی سەد ساڵیش (هۆچۆفۆن موهل ١٨٠٥-١٨٧٢) یەکەم کەس بوو کە وشەی پرۆتۆپلازمی بەکارهێناوە ئەو ڕوونی کردەوە کە پرۆتۆپلازم بنچینەی ژیانە، چونکە پێکهاتنی خانەیە لە بوونەوەر، هەروەها هەموو بوونەوەرێك لە هێلکۆکەی پیتراو دروست دەبێت. پزیشکە موسڵمانەکانیش ئەوەیان روون کردەوە کە دروستبوونی دوانە بە هۆی زۆری مەنییەوە نییە، بەڵکو تەنها یەك مەنییە، بەڵام پەردەیەك لێکیان جیا دەکاتەوە، بۆیە دوانە دروست دەبێت.

زۆر نموونەی دروست بوونی دوانە لەم جیهانە کۆنەدا هەن کە زۆر کەس سەری لەسەیریان سوڕماوە کە مێژوونووسان باسیان کردووە. کە ئەمانە هەندێکیانن:

١. قەزوینی لە کتێبەکەیدا (عجائب المخلوقات) باسی کردووە دەڵێ: لە ئیمام شافعییەوە (رەحمەتی خوای لێ بێت) ریوایەت کراوە کە دەڵێ: چوومە شارێك لە شارەکانی یەمەن لەوێ مرۆڤێکم دی لەناوەڕاستەوە هەتا خوارەوە جەستەی ئافرەت بوو و لەناوەڕاست بۆ سەرەوە دوو لاشەی جیاواز بوون کە پێکهاتبوون لە چوار دەست و دوو سەرو دوو دەم و چاو کە بەرامبەر یەکتر بوون دەیانخواردو دەیانخواردەوەو تورەدەبوون و پێدەکەنین. پاش ساڵێك دیسان ڕێم دەهەمان شار کەوتەوە هەواڵی مردنی یەکێك لە لاشەکانیان پێمدا وتیان لاشە مردووەکەمان لە لاشەی زیندوو جیاکردۆتەوە، وەڵێ لاشە زیندووەکەم دیت لە بازاڕ دەسواریەوە.

٢. دوانەی بەیەکەوە نووساو کە عەریبی کوڕی سەعد القورتبی باسی کردووە لە کتێبەکەی (خلق الجنین وتدبیر الحبالي والمولدین) کە دەڵێ: منداڵێکمان دیت لە دایك بوو کە دوو سەری هەبوو.

٣. ئەو حاڵەتەی کە باسکراوە لە کتاب (الکامل في تاریخ ابن الاثیر) لە ساڵی ٤٥٨هـ-١٠٦٥ز منداڵێك لە دایك بوو بە دوو سەرو دوولاق و دوو دەم و چاوو چواردەست بەڵام لەسەر یەك لاشە.

هەروەها لە ساڵی ٥٩٧هـ-١٢٠٠زدا منداڵێك لە بەغدا لە دایك بوو دوو سەری هەبوو. هەروەها لە ساڵی ٦٠١هـ-١٢٠٤م لەو ساڵەدا ئافرەتێك منداڵێکی بوو لە بەغدا کە دوو سەرو چوار پێ‌و دوو دەستی هەبوو کە لەهەمان ڕۆژدا مرد.

٤. هەفتەنامەی (ستارە سهیل) لە نەورۆزی ١٣٧٧هەتاوی بڵاوی کردەوە کە دوو خوشك لاشەیان لە تەنیشتەوە بەیەکەوە نووساوە تەمەنیان (٢٤) ساڵە کە پێکەوە دەژین تا ئێستاش لەیەکتر زیز نەبوون، کە ناویان (لالەو لادن)ە. ئەم دوو خوشکە لە ساڵی ١٣٥٣هەتاوی لە گوندی ناوچەی فەیروز ئابادی سەر بەپارێزگای فارس لە وڵاتی ئێران هاتنە دونیاوە. ئافرەتێکی ناساغ گەیاندرایە نەخۆشخانەی (غازی) شاری شیراز. ئافرەتەکە دوو





کچی بوو، بەڵام جەستەیان پێکەوە بوو، دواتر ناوی (لانەو لادن) یان لێ نرا. پاشان ماوەیەك لە نەخۆشخانە مانەوە، دایکیان وازی لێ هێنان، پیاوێك بەناوی (صفایان) گرتنیە ئەستۆی خۆی، چەند ساڵێك لەنێو ئەو خانەوادەیە مانەوە، پاشان لەسەر بڕیاری دادگای گشتی ئێران ئەرکی بەخێوکردنیان سپێردرا بە مانگی سووری ئێرانی کە شوێنی تایبەتی پێدان تا ژیانی تێدا بگوزەرێنن. ئەم جمکە دەتوانن کاری ناوماڵ جێبەجێ بکەن/و بە گەرمی پێشوازی لە مێوان بکەن، بۆ کرینی پێداویستیش پێکەوە دەچنە دەرێ. بۆیە (لالە) دەڵێ یەکێك لە هیواکانم ئەوەیە کە بۆ تەنیا ساتێکیش بێت جیابکرێینەوە، چونکە بیست و چوار ساڵە خۆراك و هەستان و دانیشتن و نەفس و رازمان پێکەوەیە، ئەوەش نارەحەتییەکی مەزنە. دەڵێ من ئارەزووم لەتەواوکردنی بەشی دەروونناسییە (قسم علم النفس)، بەڵام لادن حەزی لە قانونە کەمن بەهیچ جۆرێك حەزم لێی نییە.

٥. پیاوە بە تەمەنەکان بۆیان گێڕاینەوە کە لە شاری کۆیەی کوردستانی عێراق دوو برا هەبوون لە کۆندا کە لەوانەیە زۆر لە بەتەمەنەکان لە بیریان بێت، کە تەنها دوو لاقیان پێوە بوو، بەڵام لەناوەڕاست دوو لاشەی جیاوازبوون کە کاریان پینەدۆزی بووە، بەڵام سەیر لەوەدانییە کە کارەکەیان پینەدۆزی بووە، بەڵکو سەیر لەوە دایە کە دەڵێن هەر کاتێك یەکێکیان درێشەی پینەدۆزی لەدەست چەقی بوایە هاواری دەکرد ئەویتریش لە جێگای خۆی هاواری دەکردو هەستی بەئازارەکەی ئەو دەکرد.


**سەرچاوەکان:**

١. العلوم ژمارە ٨٥ ایار- حزیران ١٩٩٦ الدکتور محمود الحاج قاسم محمد.

٢. هەفتەنامەی (ستارە سهیل) ژمارەی تایبەت- نەورۆزی ١٣٧٧هەتاوی.





# مەرگ راستییەکی ئیلاهی

ئارێز محەممەد یەحیا
سلێمانی

ئەندێشەیەک کە تائێستا مرۆڤی خستۆتە ژێر رەنج و ئازارەوەو، ئەمان و دوایی هاتنی ئەم ژیانە بووە. مرۆڤ لەخۆی دەپرسێ، بۆچی هاتووینە بوون و سەر ئەم زەمینەو لەبەر چی دەڕۆین؟ مەبەست لەم بیناکردن و تێکدان و رووخاندنە چییە؟ ئایا ئەم کارە هیچ و بێ هودەیە؟ گەلێک جاران مرۆڤ بیرۆکە گەلێکی وەهای ئاراستە بەخۆی یان بەرامبەرەکەی کردووە، ئەگەر لەرووی ناز یان گلەییشەوە بووبێت. ترس و نائارامی لەمەرگ بەیەکێک لەهۆکارەکانی سەرهەڵدانی رەشبینی بیرو هزری فەلسەفی دادەنرێ.. فەیلەسوف و بیرمەندانی بەدبین ژیان و بوونیان بێهودەو داماڵراو لەهەر جۆرە نیازو ئامانج و حیکمەتێک زانیووە. ئیتر لەم گۆشە نیگایەوە تێڕوانین و روونکردنەوەیەکی وەهایان لەبارەی ئەم گرفت و کێشەیە داوە کە بۆتە هۆی دامرکاندنەوەی گوڕوتینی کڵپەی عیشق و خۆشەویستی دڵ و دەروون و دواتر ئەوان دووچاری داماوی‌و سەرلێشێوان بکات زۆر جاریش بەرەو مەرگ و خۆکوژییان بەرێت.. هەڵبەتە بەگومان و دوودڵییەکەوە پرسیار لەخۆیان دەکەن و دەڵێن خۆ ئەگەر ژیان بریتی بێ لەم هاتن و چوون و ماوە کەمەی سەر رووی ئەم هەسارەیە، ئەوا نەدەبوو بێین!! ئێستاش کە بێ حەزو ئارەزووی خۆمان هاتووین کەم تا کورتێ ئەوەمان لەدەست دێ نەهێڵین ئەم کردەوە هیچ و بێ سوودە چیتر درێژە بکێشێ. دیارە دواییهێنان بەبێ هودەیی‌و پووچییش خۆی لەخۆیدا کردەوەیەکی هۆشیارانەیە..

## نیگەرانی لەمەرگ

بەر لەوەی گرفتی مەرگ و کێشەیەک کە زاڵە بەسەر یاساکان و سەراپای گێتی گرتۆتەوە تاووتوێ بکەین و شیبکەینەوە پێویستە ئاگامان لەم خاڵە بێت، کە ترس و دۆش دامان لە مردن تایبەتە بە خودی مرۆڤ و بەس. گیانەوەرانی تر لەم لایەنەوە سەریان سووکەو کەمترین بیرکردنەوەیان نییەو تەنها ئەوەی لەوانەوە هەستی پێبکرێ رەمەک (غریزة)ی راکردن و دوورکەوتنەوەو مەیل و ئارەزووی پاراستنی ژیان و مانە لە مەترسی.. دیارە حەزی مانەوە بەواتای پاراستنی ئەم ژیانە هەنووکەییە بەوێنەی فاکتەرو پێداویستییەکی رەها (مطلق)ی تەواوی ئەم ژیانە خۆ دەنوێنێ. بەڵام لە مرۆڤ جگە لەوە، مەیلی نەمری‌و مانەوە لە داهاتووشدا بەدی دەکرێ. بەواژەیەکی تر ئەم بیرۆکەیە لە





ئێمەدا زادەی حەزێکی بنچینەییە، دەکرێ بڵێین هەر لەسەرەتادا لەگەڵ سروشتی ئەو شێلراوە. لەبەر ئەوە بیم و پەژارەی ئادەمی لە مردن کە هەمیشە بابەتێك بووەو بیرو ئەندێشەی ئەوی بەخۆیەوە خەریك کردووە، شتێك بووە جیا لە رەمەك و غەریزەی راکردن لە مەترسی. هەڵبەتە بەپێچەوانەوە لەنێو تەواوی ئاژەڵ و گیانەوەراندا ئەوە دوورکەوتنەوەیە بەکاردانەوەیەکی سروشتی دەژمێردرێ بەرامبەر مەترسییەکان.. منداڵیش لەبەرایی‌و سەرەتایی ژیانیدا بەر لەوەی ئەم غەریزەیە بەشێوەی بیرو ئەندێشە لە دەروونیدا گەشەو نەشوونما بکات سەرەتا هاوێنەی گیانەوەران لەئاست پاراستن و پارێزگاری (خود)ی بەرامبەر کێشەو گرفتەکانی مەرگهێنی بەچەکی سروشتی‌و رەمەکی راکردن لە مەترسیەکاندا بەرگری لەمانەوە دەکات.. نیگەرانی لە مردن، کۆرپەو لە دایکبووی بیرۆکەی نەمرییە. جا هەر وەك لەنێو یاساکانی سروشت هیچ مەیل و حەزێك بێ هودەو مەبەست نەهاتۆتە ئاراوە، ئالەم روانگەیەشەوە دەشێ رێگەی ئەوە بەخۆمان بدەین و بڵێین هەبوونی ئەو حەزەش لەدەروونی مرۆڤایەتیدا خۆی لەخۆیدا بەڵگەیە بۆ مانەوەو ژیانی دوای مردن! چونکە ئەگەر بەچەشنی گوڵ و گیاو درەختەکان ژینێکی بەر کورت و کاتیمان هەبوایە ئەوسا ئەو ئارەزووە لەشێوەی ویست و نیازێکی رەسەن لە ئێمەدا دەرنەدەکەوت!! بوونی تینوێتی بەڵگەیە لەسەر هەبوونی ئاو. ئیتر هەر مەیل و ئامادەیەکی رەسەنی دی رووی راستینی کەمالاتێك دەردەخەن کە توانا و مەرام و نیازەکان ئاراستەیان بۆ لای ئەوە. وەك بڵێی هەر ئامادەییەك بیروکەی یادو دیرۆك و بەسەر هاتی رابردووی کەمالاتێك بن کە دەبێ هەنگاوەکانیان بۆ لای ئەوان هەڵێنن و بگەرێنەوە. ئارەزوو و نیگەرانی سەبارەت بە نەمری‌و جاویدی کەهەمیشە مرۆڤی بەخۆیەوە وابەستەو گیرۆدەکردووە کاردانەوەو دەرەنجامی سروشت و نەهادی رازی نەبوون بەنەمان و لەنێو چوونە. نموونەو وێنەی ئەم حەزو نیگەرانییەش دروست لەوێنەی خەونەکان دەچێت، کە رەنگدانەوەو دەرهاویشتەی مەلەکات و وزەو تواناکانی حاڵەتی بێداری مرۆڤن. ئەوەی لە

## ترس و دۆشدامان لەمردن تایبەتە بەخودی مرۆڤ و بەس

جیهانی خەوندا دەردەکەوێت و دەبینرێت زایندەی راستییەکە پێشتر لەدونیای هۆش و بەرچاوی ماددەدا ئاوێتەی گیان و دەروونمان بووەو لەم دەروازەوە دزەی کردووە. دیارە بیرۆکەی مانەوەی دوای مەرگیش وەك لەم دونیایەدا بەشێوەی ئارەزوویەکی جاوید لەگیانی ئێمەدا سەرچاوە دەگرێت و پەروەردە دەبێت (کە بەهیچ جۆرێك لەگەڵ ژینی کەم و کورتی ئەم هەسارەدا یەکناگرێتەوەو جووت نابێت) دەرەنجامی دەرکەوتن و خستنە رووی راستێنی نەمری‌و مانەوەی هەتا هەتاییمانە.

ئەم بیرو ئەندێشەو راستیانەی سەروە دەرخەری ئەوەن کە حەکیم و زاناو خواپەرستان لەرابردوودا ناویان ناوە نامۆیی یان (عدم تجانس) واتە ناچۆنییەك.

## مەرگ و لەنێوچوون رێژەییە

لێرەوە کێشە بۆ مردن دروست دەبێ ئەگەر وابزانین گەرانەوەیە بەرەو دۆخی نەمان و ماڵئاوایی یەکجارەکی (هەرچەندە لەبیرو هزری بەدیهێنەردا توخمێکی




خاوو كۆن بووين بەگوێرەی وتەو بڕوای زۆر لە فەیلەسووفەكان) لەكاتێكدا فەوتان و ونبوون نییە بەڵكو گۆڕان و پەرەسەندنە، نەمان و ئاوابوونی رواڵەتێك و پێشوازی كردنە لەشێوەیەكی تر. بەدەربڕینێكی دیكە مردن كوژاندنەوەو فووكردنە مۆم و رووناكایی ئەم تەمەن و ژینەیە، بەڵام نەك بەرەو پووكاندنەوەو دامركانەوەی هەمیشەیی، بەڵكو كاتیو رێژەییە بەواتای گوم بوون و نادیاری شێوازێك و چوون بەرەو لەدایكبوونەوەیەكی تر. مرۆڤ مەرگی هەتا هەتایی نابینێ، چونكە بۆ ئەو جگە لەوەستهێنانی حاڵەتێك و بارێك شتێكیتر نییە ، نموونەی هەر گۆڕانكارییەكیتر لەچاو ونبوونێكی رێژەییە.. كاتێك خاكێكی رووتەن و وشك دەكۆڕێ بەگیاو سەوزایی ئا لەم وەختەدا ئەم زەوییە بەرەو مردن دەڕوات وەڵێ نەك مەرگی هەمیشەیی. خاك شێوەو رووكارو تایبەتمەندێتی پێشینەیی خۆی لەدەست داوە ئیتر ئەو رەنگ و روخسارو رەوشتەی پێشووی كە لە بەردێك نزیكتر بوو تا خۆڵ نەیماوە. بەڵام ئەگەر بەشێوەیەك گیانی لەدەست دابێ ئەوا بەشێوەیەكیتر دەستگیربووە.

## دونیا
## پزدانی رووحە

دەكرێ گواستنەوەمان لەجیهانەوە بۆ دونیای ئەو دیوی سروشت لەبوونی كۆرپەو هاتنە دەرەوەی منداڵ لەنێو منداڵدانی دایك بچوێنین و لەیەكتریان نزیك بكەینەوە. ئەگەر چی ئەم وێكچواندنەشمان لەلایەك وەك كارێكی نەرێتی (سلبی) خۆی دەنوێنێ و لەسەرێكیش بەكردەوەیەكی ئەرێتی (ایجابی) دادەنرێت. لەم رووەوە نەرێتی

**مردن فەوتان و ونبوون نییە، بەڵكو گۆڕان و پەرەسەندنە**

دێتەبەر چاو، چونكە جیاوازییەكانی هەردوو جیهانی ماددیو ئەو دیوی سروشت و بینایی جەوهەریو قووڵترن لەدونیای منداڵدان و ژینگەو ژیانی دەرەوەی ئەو. مەڵبەندە ژینێك كە پزدان پێكی دەهێنێ لەگەڵ دەرەوەی خۆیدا، دەتوانین بڵێین ئەمانە هەردووكیان دوو رووی ژیانێكن. ئەویش بریتییە لەژینی دونیاو سروشتی ئەم سەرزەمینە. وەڵێ هەردوو جیهانی بژوونیو ئەنبووژەنی، ئەمانە دوو ژیان و روخسار پێشاندەدەن بەكۆمەڵێك جیاوازی رەسەن و بنچینەییشەوە.. كەچی ئەم لەیەكچوونە لەلایەكی تریشەوە ئەرێتییە لەو رووەوە كە جیاوازی هەل و مەرج نیشان دەدات. (كۆرپە) لەنێو پزدانی دایكدا لەرێی ناوكەوە خۆراك دەخوات. بەڵام كاتێ پێ دەنێتە ئەو زەوییەوە ئەم رێگەیە بەبنبەست دەگات و نامێنێت ئیتر لەرێی دەم و لولەی سورینچك و گەدەوە خۆراك و خواردنەوەی پێویست وەردەگرێت. تەواوی ئامرازو كەرستەكان لەنێو منداڵدان دروست دەبن بۆ وێنە (.. .. ..) بەڵام هیچ یەك لەو ئامێرانە (تا منداڵ جێگەكەی ئەوێ بێت) بەكار نابرێن مەگەر دوای ئەوەی لەدایك دەبێ.. شتێكی سەیرو سەرسوڕهێنەرە كۆرپەڵە تا لەم شوێنەدا مانەوەی هەبێت كەمترین سوود لەرێرەی هەناسەدان و سییەكان وەرناگرێت. تەنانەت گریمان ئەگەر لەو كاتەدا بۆ ساتێك ئەو دەزگایە بكەوێتە كار ئەوسا دەبێتە هۆی مەرگی ئەو.. دیارە ئەو حاڵەتەش هەروا





دەمێنێتەوەو درێژەی دەبێت تا دوا ساتەکانی مانەوە لەنێو پزداندا. بەڵام بەهاتنی بۆ سەر شانۆو گۆرەپانی ئەم ژینە لە پڕ دەزگای هەناسەدان دەکەوێتە کار. هەڵبەتە لەم ئان و ساتەدا

## مەرگ لەبەرامبەر ئەودیوی سروشتدا لەدایکبوون دەگەیەنێ

بۆ چەند چرکەیەك ئەم ئامێرە ئەگەر لەکار بکەوێ ئەوسا دەبێتە مایەی مەرگ و نەمانی ئەو منداڵە. ئا بەم شێوەیە یاساکانی ژیان بەر لە بوون و دوای ئەوەش دەگۆڕێن و جیان لەیەکتر، واتە دوو یاساو رێسای حەیاتی جیا لەیەکتر ئەم دوو جیهانە بەڕێوە دەبەن.. لەراستیدا دەزگاو ئامێری هەناسەدان لەماوەی ئەو چەند مانگەی مانەوە لەنێو پزدانی دایکدا دروست دەبێت، بەڵام شتێك نییە بتواندرێت هەر لەوێدا سوودی لێ ببیندرێ. بەڵکو پێشبینیی و ئامادەییەکی پێشووترە بۆ هەل و مەرج و ژینگەو ژیانی دوای بەسەرچوونی ئەم قۆناغە. ئامرازەکانی بینین، بیستن، چەشتن و بۆنکردنیش سەرەڕای ئەو چۆنیەتی و فرە ئاڵۆزییەش

کە لەهەر یەکێکیاندا بەدی دەکرێ ئەوانیش هەروەها هیچ کامێکیان ناشێن بۆ ئەو ناوەندە ژیانەی منداڵدان، بەڵکو لەکات و ساتێکی دیکەدا سوودیان لێوەردەگیرێ. ئیتر جیهانیش لە بەرەو رووی دونیای ئایندەو ئەم دیوی پەردەدا وەها خۆی دەنوێنێ، واتە وەك پزدانی دایك وایە. لەوێدا ئەندام و ئامێرەکانی دەروونی مرۆڤ دروست دەبن و دێنە کایەوە بۆ ئەوەی خولیاو حەزی چوونە نێو هەوارو مەفتەنێکیتری لەلا بروێنێ. ئامادەییە دەروونییەکانی مرۆڤ، سادەو ساکاریو دامەزراویو ئارامی رێژەییو دابەش نەبوونی من یا (نفس)ی ئینسان. حەزو ئەندێشەی بەرفراوان و بێ کۆتایی ئەو. ئەمانەش هەمووی سازو بەرگێکی شیاون لەگەڵ ژینێکی پان و دوو رووبەر درێژو هەمیشەییو بەردەوامتر. هەر بۆیەش ئەوەی مرۆڤایەتی بەرامبەر ژینی بەرکورتی ئەم خۆڵ و زەوییە دووچاری ناچۆنییەکیو ناموێی کردووە

ئەم شیکردنەوەو بیرو تێگەیشتنەی لای سەرەوەیە. جانەگەر ئادەمی دوای ئەو هەموو حەزو ئارەزوو ئامادەییانەی هەیەتی بەرەو خوداوەندو دونیایەکیتر نەگەڕێتەوە، دروست ئەوە دەگەیەنێ کە لەو دیوی ژینگەی منداڵداندا هیچ ژیانێکی تر لە ئارادا نەبێت و وردە وردە (زەو) بەرەو نەمان و لەیاد چوونەوە بێت.

دیارە ناگونجێ مرۆڤ خاوەنی مێشك، دەمار، سیو هەستەکان و کۆمەڵێك ئامێری تر بێت، کە بەکەلکی دونیای منداڵدان نایەن، هیچ مەبەست و ئامانجێك لەودیوی دروستکردنیانەوە نەبێت و بەرەو نەمان و پوکانەوە هەنگاو بنێن.. ئیتر سەبارەت بە زاراوەی مەرگیش لێرەدا تێگەیشتن و واتای لەنێو چوون دەدات بەدەستەوە، بەڵام لە بەرامبەر دونیای ئەم دیوی سروشتدا لەدایکبوون دەگەیەنێ. هەروەك هاتنی نەوەیەکی نوێ بۆ ئەم جیهانە لەدایکبوونی پێی دەگوترێ، وەلێ لەئاست ژیانی پێشینەیی ئەودا ون بوون و لەنێو چوون دەڵێن.





# تۆماس كارلیل و مەزنی پێغەمبەری ئیسلام (د.خ)

عوسمان عەبدولڕەحمان

بەریتانیا لە سەدەی نۆزدەدا كۆمەڵێ نووسەرو شاعیرو مێژوونووسی بەخۆیەوە بینی، كە ڕۆڵی گرنگیان لەبەرەو پێش بردنی ئەدەب و ڕۆشنبیری هەبوو، دواتر كاریگەریشیان لەسەر مرۆڤایەتی دەركەوت، جا یەكێكیش لەوانە (تۆماس كارلیل)ی فەیلەسووف و مێژووناسە (١٧٩٥-١٨٨١ز)، كە لەهەموو هاودەم و هاوكارەكانی تری پایە بەرزترو ناسراوترو بەناوبانگتر بوو، گەورەیی و بەرزییەكەشی لە كەسایەتییە مەبەست روون و ناوەڕۆك ڕەسەن، دڵسۆزیی و ڕاستگۆییەكەی دابوو، ئەم فەیلەسووفە هەمیشە ئارامگرو لەسەرخۆ بوو لە لێكۆڵینەوەو گەڕان و پشكنین، بەردەوام بوو لەسەر نووسین و بیركردنەوە بێ ئەوەی ناوبانگ یاخود پارەو سامانی مەبەست بێت و خۆی بەدوایانەوە ماندوو بكات.

تۆماس كارلیل لە گوندی (ئەكلەفان) لە هەرێمی (ئەناندال)ی خوارووی سكۆتلاندا لە ساڵی (١٧٩٥ز) لە دایك بووە، بنچینەی زانستی لە قوتابخانەی گوندەكەیان وەرگرتووە، دواتر لە گوندێك بەناوی (ئەنان) و ئینجا لە تەمەنی سێزدە ساڵیچۆتە زانكۆو، لەتەمەنی نۆزدە ساڵیدا واتە لە ساڵی (١٨١٤)دا بۆتە مامۆستای وەرزش لە قوتابخانەی (ئەنان)و، دوای سێ ساڵ لەم كارە بۆتە بەڕێوەبەری قوتابخانە لە شارۆچكەی (كرگالدی). لە ساڵی ١٨١٨ دا پیشەی فێركردنی جێهێشتووەو، چۆتە ئەدنبرگ و زانستی كانزازانی خوێندووە، كەبۆتە هۆی بەرزبوونەوەو دەركەوتنی، كاتێ وتاری زانستی لە فەرەنسییەوە وەردەگێڕا، بەڵام بەهۆی بەجێهێشتنی كارەكەیەوە دایك و باوك و خزمەكانی لێی دڵگیربوون و سەرزەنشتیان كردووە، بەڵام ئەو ئەمەی بە گرنگ دانەناوەو پشتگوێی خستووە، هەروا لەسەر ڕاو بۆچوونەكانی بەردەوام بووە.

دواتر تۆماس كارلیل لە شاری لەندەن جێنشین دەبێ‌و، هەر لەگەڵ جێنشین بوونیشدا متمانە بەتوانا ئەدەبییەكانی خۆی پەیدادەكاو دەبێتە ڕێبواری ڕێگای نووسەرو ڕەخنەگرە ناودارەكان، چاوپێكەوتنیشی لەگەڵ جەماوەر بەهۆی زنجیرەیەك سیمینارەوە بووكە لەم سەردەمەدا لەبارەی (مێژووی گیانی مرۆڤ لە كۆنترین چاخەوە تاوەكو سەردەمەكەی لە ساڵی ١٨٣٨)ەوە

پێشکەشی کردووە، دواتریش داهێنانی لەم سیمینارانەوە بەرزتر بوونەتەوە، لەم کاتەدا کە کۆمەڵێ سیمیناری تری دەربارەی (پاڵەوانان و پەرستنی پاڵەوانان) پێشکەشی کردووە، ئەویش لە ساڵی ١٨٤٠ کە جێی رێزو رەزامەندی گەورەی جەماوەربوو.




کارلیل (٨٦) ساڵ ژیا، ئەم ژیانەشی لە دانان و نووسینی ژمارەیەك کتێبی پڕ بایەخ و چاك بەسەربردبوو لە بابەتی فەلسەفەو مێژوو ئامۆژگاریو پەندووەرگێڕانەوە پێشکەش کرد، کەبەناوباگترین کتێبیشی کتێبی (Heroes and Hero- worship)[1] -پاڵەوانان و پەرستنی پاڵەوانانە، کە بۆ زۆر لە زمانان وەرگێڕدراوە، هەروا کتێبەکانی تری وەکو (شۆڕشی فەرەنسا)و (رابردوو و هاوچەرخ)و کتێبی (سارتور رزار تووس یا فەلسەفەی جل و بەرگ)و هەروا کتێبەکانی تری وەکو (ژیانی کرۆمۆێل)و (مێژووی فریدریکی شای بروسیا)یە.

بەڵام لە رووی نووسین ئەوا کارلیل لە هەموو نووسەرانی تری سەردەمی خۆی بە نووسەرترو رەوانبێژترو زمان پاراوتر دادەندرێت.

کارلیل بەدرێژایی ژیانی سەربەست بووە لە بیروڕاکانیو سوورتر بووە لەسەر ئەم بەڵگانەش کە خۆی بڕوای پێبووە بەشارەزاییو لێزانی خۆی، هەروەکو رەزامەندبوون و دڵگیربوونی خەڵکی تری زۆر لا گرنگ نەبووە لەوەی نووسیویەتی، هەروەك رازی بوون و دژە وەستانی لا شتێکی ئاسایی بووە، کاتێکیش کە خۆیو ئەدەبەکەی بەرزبوونەوە بۆ لوتکەی سەرنج راکێشیو پێخۆشحاڵی خەڵك و (اعجاب)یان پێی، لەم کاتەشدا نەبوو بەدیل و بەندی ئەم بۆچوونەی خەڵکەکە، بەوەی کە ئەوان چییان گەرەکە روو لەمە بکات، بەڵکو لەسەر راوبۆچوونەکانی خۆی پێداگرترو سوورتربوو، تەنیا ئەوەش کە خۆی بڕوای پێهەبوو دەیگوت، ئەگینا هیچی تری لا گرنگ نەبوو، هەروەك هیچیشی وەرنەدەگرت تەنها ئەمەی خۆی باوەڕی پێبوو و رەزامەندی خۆی لەسەر نەبێ، نهێنی رێزو قەدر زانینی خەڵکیش بۆی ئەوە بوو کە ئەم نووسەرە گەیشتە رادەی پێکهێنانی بڕواو بیری خۆی بە تاقی کردنەوەو هەوڵی بەردەوام، ئەو خۆی فێرکرد

کارلیل بەدرێژایی ژیانی سەربەست بووە لەبیروڕاکانیو، تەنیا ئەوەشی دەگوت کە خۆی بڕوای پێ هەبوو





پێش ئەوەی بچێتە سەر ئەم زانیاریانەی فێرکردنی خەڵکی‌تر.

## چاکترین بەشی کتێبەکەی کارلیل لەبارەی پێغەمبەرە

کتێبی (پاڵەوانان) کە بەناوبانگترین کتێبی ئەم نووسەرەیە باس لە چەمکی پاڵەوان و کۆمەڵێ کەسی پاڵەوان دەکات وەك نووسەر پێیانەوە سەرسام (معجب) بووە، کەوا توانیویانە جێو شوێن و پێگەی خۆیان لە مێژووی مرۆڤایەتی‌و کۆمەڵگەی بەشەریدا هەبێ، هەروەکو ناویشیان لەدوارۆژدا بەنەمری‌و زیندوویی بمێنێتەوە، ئەو پاڵەوانانەی کە لەم کتێبەدا هەڵبژاردوون لەپێشووتریشدا بە سیمینار پێشکەشی کردوون هەمەجۆرو هەمە پیشەن. لەپاڵەوانانی شیعر دانتی‌و شکسپیری هەڵبژاردووە، لەهی چاکسازی ئایینی مارتن لۆسەری دەستنیشان کردووە. لە پاڵەوانانی نووسین ژان ژاك رۆسۆ، لەهی پاشایان کرۆمۆێل و ناپلیۆن بۆناپارتی داناوە، بەلام لەرووی دەستنیشان کردنی پەیامبەرو نێردراوانی خوا ئەوا پێغەمبەری ئیسلام (د.خ) هەڵبژاردووە، ئەم کارەی نووسەر بە ساکاری‌و لەخۆوە نەبووە، بەڵکو زۆر بە لێزانی‌و شارەزایی‌و بەوردی ئەمانەی هەڵبژاردووە، ئەگینا نووسەر بە ژمارەیەکی زۆر لە پاڵەوانان سەرسام بووە، بەلام ئەم ژمارە کەمەی بەپلەی یەکەم داناون و ئەوانی‌تری لەدوای ئەوانەوە داناوە. هەر لێرەشدا بلیمەتی‌و راستگۆیی کارلیل دەردەکەوێت لەلای رەخنەگرو لێکۆڵەرەوان، رووی راستبێژی بابەتیانەشی خۆی دەردەخات، کە پابەندی‌و خۆشەویستی بەگەل و دواکەوتەی ئایینەکەی‌و دەمارگیری بەسەر بیرودڵیدا زاڵ نەبووە، هەروەکو چاویشی لە هەقیقەت نەپۆشیووە ئاواش فێڵ وفری لە مێشکی خۆیی‌و کەسانی تر نەکردووە، کە ئەمەش پێچەوانەی نووسەرانی ئەم سەدەیە بووە کە بەسەدەی بێباوەڕی‌و کوفر دادەنرێت سەبارەت بەمان. ئەمەش بەهۆی ئەوەوە کە چاکترین بەشێ لەم کتێبە دەربارەی پێغەمبەری گەورە محەممەد(د.خ)، کە لەپێش ئەم کتێبەو نووسەرەکەی‌و، هەروا لەکاتی بڵاوکردنەوەشیدا لەلایەن نووسەران و رووناکبیران-وادەژمێردرێن- جێی زۆر تانەو تەشەرو رق و کینی رۆژئاواییەکان بووە بەتایبەتیش لە سەدەی هەژدەم، کەوا بەجۆرەها ناوو ناتۆرە باسی ئەم پەیامبەرەیان کردووەو دژایەتی ئاشکراشیان لە بەرامبەریدا نواندووە. بەلام کاتێ ئەم کتێبەی نووسەری گەورە (کارلیل) دەرچوو، هەر وەکو ریچارد جازبیت دەڵێ: (کاتێ کارلیل وتارەکەی لەبارەی ئیسلامەوە نووسی کە محەممەدی(د.خ) بەچاکی باسکردو کاری ئەوانی تری نەهێشت وتەکانیانی پێ بێ خێرو ئیفلیج کردن و، وەلامی گشت قسە هەڵبەستراوو جوێنەکانی ئەوانی دایەوە، بە لاپەرەیەکی سپی، تا وەکو شەرەفی ئەم پێغەمبەرە چووە ئەم ولاتەوە، بەهۆی ئەم فەیلەسووفە گەورەوەو، هەقی ئەوەشی بە ئیسلامدا کە هەموو کەس سوپاسی ئەم پاڵەوانە واتە -پێغەمبەر (د.خ)- پایە بەرزە بکەن لەم دەستە سپییە پاکەی‌و ئەم مننەتە گەورەیەشی.

ئەوەتا کارلیل لە سیمینارەکانیدا لەبارەی پاڵەوان لەشێوەی نێردراوەوە دەڵێ: (دەمارگیرە فەلەکان-نصاری- وبێ بڕواکان-الملحدون- بانگەشەی ئەوە دەکەن کە محەممەد (د.خ) لە

ئەوانەی وای بۆ دەچن کە ئایینی ئیسلام درۆیە محەممەدیش (د.خ) هەڵخەڵەتێنەری ساختەیە، ئێستا کاتی ئەوە هاتووە دژایەتی چەشنی ئەم وتە نابەجێو پڕشەرمانەی بڵاودەکرێنەوە بکەین، ئەم پەیامەی ئەو نێردراوە هێناویەتی هێشتا چرایەکی رووناکە بۆ ماوەی دوازدە سەدە بۆ نزیکەی دووسەد ملیۆن کەسی[٣] وەکو ئێمە...زۆر بەداخەوە چەند پۆخڵە ئەوەی دەیڵێن و خاوەنەکەشی چەند بێ هێزە، ئەمانە شایانی لاواندنەوەو بەزەیی پێداهاتنەوەن ئەوەش کە دەیەوێ بگاتە پایەیەك لە زانستەکانی بوونەوەر هیچ باوەڕ بەم شتە پڕوپوچانەی ئەم گێلانە ناکا! ئەمە دەرەنجامی نەوەی کوفرو سەدەی ئینکاریو بێ باوەڕییە ئەمەش بەڵگەی دڵپیسیو بێ ویژدانیو گیان




هەڵسانەوەیدا هیچ شتێکی مەبەست نەبووە تەنیا ناوبانگی کەسیەتیو شانازی پلەو پایە ودەسەڵات نەبێ، نەخێر سوێند بەخوا لە دەروونی ئەم پیاوە گەورەیەدا، کوڕی ئەم ولاتە بێ بەرەکەت و کەمبایەخە[٢]، چاوکراوە، دەروون گەورەیە، پڕ رەحمەت و چاکە، بیرەکانی غەیری تەماعی دونیا بووەو، مەبەستیشی جیا لە داواکاری دەسەڵات و پلەو پایە بووە، چۆن ئەم کەسە بێ دەنگە گەورەیەو، پیاوێکیش لەوانە نابێ تەنیا گەر دڵسۆزو راست نەبێ).

هەروا کارلەن رووردەکاتە ئەوانە کەوا ئیسلام بە درۆ دادەنێن و پێغەمبەرەکەشی بە هەڵخەڵەتێنەر دەزانن دەڵێ: (لەگەورەترین خەوشەکانی ئێستا لەسەر هەموو تاکێك لەم سەردەمە گوێبداتە

مردووییە لە ژیانی لاشە، لەوانەیە جیهان هیچ رایەکی لەمە کافرتری نەبینیبێ).

هەروا لە شوێنێکیتردا بە روون و ئاشکرایی لەم سەردەمەدا هاوار دەکات: (من محەممەدم خۆش دەوێت لەبەر بەرائەتی سروشتی لە ریاو سپاردنی رێگای چاکە) هەروا بەم جۆرەش باس لەم پێغەمبەرە بەرێزە (د.خ) دەکات: محەممەد (د.خ) رازی نەبوو کە سوود لە درۆ هەڵبەستراوە باوەکان ببینێو سەرچاوەی دەلەسەکان بپۆشێ، تاکو تەنیا بوو بەخودی گەورەییەکەیو بەراستییەکانی بەرێوەچوون و بوونەوەر، نهێنی بوون بەچاوانیدا دەدرەوشایەوە، بەهەموو گەورەییو ترسناکیو پرشنگداریو خۆشی بەخشییەکان، هیچ شتێکی پڕوپوچ نەبوو چاو پۆشی لێبکات، گەر قسەی کرد




## کارلیل بە پێچەوانەی نووسەرانی سەردەمەکەی چاوی لەحەقیقەت نە پۆشیووە

هەموو گوێچکەکان گوێبیست دەبن، هەموو دڵەکان هۆشیارن، هەموو وتەیەك جگە لە هی ئەو بێ بەهایە، هەموو وتەکان وشکن، هەروا بە درێژای سالان هەر لە رۆژانی کۆچکردن و سەفەرەکانی هەزاران بیر بە مێشکیدا دەرۆیشتن، من چیم؟ ئەو شتە چییە کە خەڵك پێی دەڵێن گەردوون؟ ژیان چییە؟ مردن چییە؟ چی بکەم؟

ئایا بەردەکانی چیای حەرا وەلامیان دایەوە؟! یان ئەم خاکە بێ بەرەکەت و کەم بایەخە؟

نەخێر نەکووپی گەردوونی خڕ، نەجیاوازی شەوو رۆژ نە ئەستێرەی پرشنگدارو نەهەوری باران بار، وەلامی ئەوانە نییە، تەنیا لە گیانی پیاوەکە مەبەست پێغەمبەرە (د.خ)- نەبێ. ئەگینا خوای گەورە ئەم نهێنییە گەورانەی نە دەخستە دڵییەوە.

دوای ئەوەش ئەم فەیلەسووف و مێژوو نووسە زۆر بەشێوەیەکی بابەتیانە باس لە ژیانی پێغەمبەری گەورە (د.خ)و کۆمەڵگەی ئەم سەردەمەی نیمچە دوورگەی عەرەبی و، کاریگەریەکەی لەم سەردەمەو دواتریش باس دەکات، هەروەك وەلامی بابەتیانەی گشت قسە پرو پوچ و هەڵبەستراوو ئیفتراکانیش دەداتەوە کەوا لەم سەردەمە ببوو بە ئاڵقەی گوێچکەی نووسەرو شاعیرو کەسانی دژ بەئیسلام و پێغەمبەرەکەی وەلامیکی راست و دروست و حەقی ئەوانەش دەداتەوەو، سەرزەنشتی ئەوانەش دەکا کە بەبەغا ئاسا بەبێ لێکۆڵینەوەو بەدواداچوون و بیرکردنەوە ئەم وتانە دووبارە دەکەنەوە.

### پەراوێزەکان:

١. ئەم کتێبە کاتێ کراوەتە عەرەبی، بەناوی (الابطال) بلاوکراوەتەوە، لەلایەن (محمد السباعي) لە ساڵی ١٩٣٠دا چاپی سێیەمی لێ بلاوکراوەتەوە.

٢. مەبەست لەوەیە کەوا پێغەمبەر (د.خ) لە ولاتێکی بێ بەرەکەت و کەم بایەخ و وشکی وەکو نیمچە دوورگەی عەرەبی سەری هەڵداوە.

٣. دیارە لێرەدا مەبەست لە ژمارەی موسڵمانانی ئەم کاتەی نووسینی کتێبەکەیە کە (٢٠٠٠٠٠٠٠٠) کەس بوون.

### سەرچاوە:


١. توماس كارليل، الابطال، عربه الكاتب الكبير محمد السباعي، دار الرائد العربي، الطبعة الرابعة، بيروت، ١٩٨٢.

٢. د. محمد عبيد الكبيسي، على هامش ذكرى المولد النبوي الشريف، توماس كارلايل والعظمة، مجلة (الرسالة الاسلامية) العدد (٢٠٧،٢٠٨)، بغداد، ١٩٨٧.

٣. محفوظ العباسي، الغرب نحو الدرب باقلام مفكريه، الطبعة الاولى، مطبعة الزهراء الحديثة، الموصل، ١٩٧٠.




گێشەیەك لە زانكۆی ئەزهەری شەریفدا

# پیشەگەری وەرزشی حەڵاڵە یان حەرام؟

ئا: دلێر ئیبراهیم

زانایانی ئیسلام لەمبارەیەوە راو بۆچوونی جیاجیایان هەیەو.. وەرزشوانانیش سەریان لێشێواوە، لەبەر ئەوەی (پیشەگەری وەرزشی) سەرچاوەیەکی گرنگی داهاتیانە لە جیهانی خۆرئاوادا، لەشێوەی بۆندێك لە گرێبەندە هاوچەرخەکان کە پەیتا پەیتا لە جیهانی ئیسلامی و وڵاتە عەرەبیەکاندا دەستی کردووە بە بڵاوبوونەوە..

جارێك پێی دەگوترێ (گرێبەندی فرۆشتن) و جارێکیش بە(خواستنەوە) دادەنرێت، هەر دووکیشیان لەبەرامبەر بڕە پارەیەك دەگاتە چەند هەزار یاخود چەند ملیۆن جونەیهێك کە یانەکان و یاریزانە پیشەگەرەکە وەدەستی دەهێنن.. یاریزانیش بەپێی ئەم بۆندانە لەنێوان یانە ناوخۆییەکاندا گوزەر دەکەن.. یاریزانە ناودارو کارامەکانیش بەرەو یاریگاکانی ئەوروپا هەنگاو هەڵدێنن، دوایین سیماکانی پیشەگەریش بەپێچەوانەی مەسەلەی یاریزان (ئیبراهیم سەعید) کە بۆ یانەی (ئەهلی) و هەڵبژاردەی میسر یاری دەکات مەسەلەی پیشەگەری یاریزان (تاریق سەعید)ە، کە یاریزانی یانەی (زەمالیك)ە و خاوەنی نازناوی باشترین یاریزانی میسری بوو بۆ ساڵی ٢٠٠٠، کە بەم دواییە گرێبەستی لەگەڵ یانەی (ئەندەر لێخت)ی بەلژیکی مۆرکردووە، دوای ئەوەی (زەمالیك) رازی بوو (تاریق) بە (٤)ملیۆن جونەیهیی میسری بفرۆشێت و، خودی یاریزانەکەش مووچەیەکی مانگانەی بەبەهای (٣٠)هەزار دۆلار دەستدەکەوێت جگە لە (٦٠) هەزاری دیکە بۆ کرێی خانوو و ئۆتۆمبێل. ژمارە راستەقینەکانی ئەو بڕە پارەیەش دیاری نەکراوە کە تاریق لەسەرەتادا وەریدەگرێت.

بەر لەویش مەسەلەی (ئیبراهیم سەعید)ی یاریزان وروژێندرا کە مشت ومڕێکی زۆری لێکەوتەوە بەهۆی ئەو بۆندەی کە لەگەڵ یانەی (ئەهلی)دا مۆری کردبوو، کە نابێ لە دەرەوەی وڵاتدا ببێتە یاریزانێکی پیشەگەر.

## لەنێوان شەریعەت و یاسادا

لەبەر ئەوەی ئەم مەسەلەیە تا رادەیەك لەسەر گۆڕەپانی وەرزشی ناوچەکە نوێیەو، گرنگیو بەهای خۆی هەیە، کە



لێتوێژەری میسری (ئیبراهیم عەلوان) لە زانکۆی (ئەزهەر)ی پیرۆز کردوویەتی بەلێکۆڵینەوەیەکی زانستی شەرعیو بەمەبەستی وەدەستهێنانی بڕوانامەی (دکتۆرا) پێشکەشی کردووە..

لەسەرەتادا ناوبراو پێی وایە موسڵمان گشت یارییەکی شەرعی بۆ حەڵاڵ بێت تا تیایدا ببێتە پیشەگەر، گەرچی باشترە، خۆی بەکارێکی سوود بەخشی تر خەریك بکات.

ئافرەتی موسڵمانیش هەر لە بنەڕەتەوە بۆی نییە یاری وەرزشی بکاتە کارو پیشە، چونکە لەمەدا خۆی بەپیاو دەشوبهێنێ، پێغەمبەریش (د.خ) نەفرەتی لەو ئافرەتانە کردووە کە خۆیان بەپیاو دەشوبهێنن.. بەهەمان شێوەش نەفرەت لەوپیاوکراوە خۆی بەژن بشوبهێنێ..

توێژەرەوەکە بۆندەکانی پیشەگەری وەرزشی بەشێوەیەکی نوێی (بەکرێدانی مرۆڤ) لە قەڵەم دەدات لە فقهی ئیسلامیدا، بەمەش (پیشەگەر) دەبێتە کرێگرتەی یانەو بە ڕێکخستنی فیقهی لە ڕیزبەندی کرێگرتەی تایبەتی دەردەچێت.

هەروەها (بەڕێز ئیبراهیم عەلوان) دووپاتی دەکاتەوە کە گرێبەندی پیشەگەری وەکو (بۆندی کارکردن) وایە کە (یەکێتی تۆپی پێی میسری) دایڕشتووە. توێژەر ئاماژە بۆ ئەوەش دەکات کەنابێ وشەی (فرۆشتن) بەکاربهێنرێ لە بۆندی پیشەگەریدا لەبنەمای ڕێزگرتن لە مرۆڤ و، تاوەکو مرۆڤ وەك کەل وپەلێکی کڕاوو فرۆشراوی لێنەیەت.

هەروەها ناوبراو پێی وایە پیشەگەر بوونی موسڵمان لای غەیرە موسڵمان شتێکی ئاسایی بێت گەر دڵنیابێت دین و دونیای خۆی لەدەستنادات، بەپێچەوانەش موسڵمان دەتوانێ غەیرە موسڵمان لە ریزی خۆیدا وەربگرێت، جا چ یاریزان یاخود ڕاهێنەر بێت.

بەڵام لەهەمان کاتدا ڕاهێنەری نا موسڵمانی پێ چاك نییە ئەوەك موسڵمانان بەدەستیەوە بکەونە ناڵەو ئازار یاخود بەگەورەی بزانن و لە پارەی دارایی موسڵمانان (بيت المال)دا بۆی سەرف بکەن. هەروەها لێکۆڵینەوەکەی تاریق عەلوان داکۆکی لەسەر پابەندبوونی پیشەگەر بەبڕگەکانی بۆندەکە دەکات بەجۆرێ بەخۆی یارییەکان بە لێهاتووی ئەنجام بدات و، ڕێز لە بڕیارەکانی یانەکە بگرێت بەجۆرێك کارەکانیان ناشەرعیو حەرام نەبێت و، لەچوارچێوەی ڕێکەوتنی ناو بۆندەکەدا بێت.هەروەها دەبێت پارێزگاری لەش و لاری خۆی بکات و کەل وپەل و دەزگاکانی یانەکە لە تێکچوون و فەوتان بپارێزیو نهێنیەکانیان ئاشکرا نەکات.

دەبێ یانە وەرزشییەکەش بەپێی ڕێکەوتنی بۆندەکە کرێی وەرزشوان لە کات و ساتی خۆیدا دابین بکات و مۆڵەتی پێویستی پێبدات و بەشێوەیەکی مرۆڤانە مامەڵەی لەگەڵدا بکات.

## شەریعەتی ڕێکەوتووەکان

(شێخ عەبدولعەزیم حەمیلی) ئەندامی لێژنەی فەتوای زانکۆی ئەزهەری پیرۆز لەلایەنگرانی بۆندەکانی پیشەگەری وەرزشییەو بەحەرامی نازانێ لە ڕوانگەلای بنەمای فقهی (گرێبەست شەریعەتی ڕێککەوتووەکانە) بەمەرجێ لەژێر ڕۆشنایی بنەما ئیسلامییەکاندا بێت. هەروەها دەڵێ: بەم دواییە لەهەندێ یانەدا لەدەرەوەو ناوەوەی میسر کرداری پیشەگەری وەرزشوانان لەگشت بوارەکانی وەرزشدا پەیدابووە، کە تیایدا پسپۆڕیو هەوڵ و کۆششەکانیان پێشکەش بەیانەکان دەکەن. ئەمەش خۆی لە خۆیدا کارە لە





ئەمڕۆ لەجیهانی خۆرئاوادا پیشەگەری وەرزشی بۆتە سەرچاوەی داهات

موسلمان دەتوانێ غەیرە موسلمان لەڕیزی خۆیدا وەربگرێت

بڕی کرێ بۆ ماوەیەکی دیاریکراو ئەمەش بۆندێکی شەرعییە..

بۆندیش شەریعەتی ڕێککەوتووانەو نابێتە بۆندی کڕین و فرۆشتن و نووسینی بڕگەی (فرۆشتنی فلان یاریزان بۆ فلان یانە) بە تاڵە، چونکە بۆندە شەرعییەکان ڕێگا بەمە نادەن و مرۆڤیش کڕین و فرۆشتنی لەسەر نییەو، دەبێ ئەم پیشەگەرییە بەکارێکی دیاریکراو بۆ ماوەیەکی دیاری کراو دابنرێت.

## دەلالە وەرزشییەکان

میانگیرێك لەنێوان یاریزان و یانەدا هەیە، ئەو میانگیرە دەقاو دەق کاری (دەلال)ی دەکات، حەقی خۆیەتی پارەی دەلالی وەربگرێت، بەڵام نابێ ئەو دەلالە درۆو دەلەسە بکات و لەپێناو ڕێکخستنی بۆندەکە شتی ناڕاست بڵێ.

کاتێکیش دەلال دەست لە بۆندەکەو پارەی یاریزان وەردەدات و ناوی یانەکە دەزڕێنێ، ئەوا بە دەلالێکی ناشەرعی دادەنرێت. بۆیە دەبێ دەلال ڕاست و ڕەوان و بێ پێچ و پەنابێت دەبێ یاریزانیش بە لێهاتووی و پسپۆرییەوە لەگەڵ یانەکەدا کاربکات.

## پیشەگەری ئافرەتان

(شێخ حومەیلی) داکۆکی لەسەر ئەوەش دەکات کە حەرامە ئافرەتە موسڵمانەکان لەدەرەوەی وڵاتانی خۆیاندا سەرقاڵی پیشەگەری وەرزشی بن، چونکە ئەم کارە پێچەوانەی سروشتی ئافرەتانە کە شەرع داوای لێدەکات پارێزگاری لەخۆی بکات و سەرپەرشتی خۆیو خێزانیو وڵاتی خۆی بکات، لەبنەمای شەرعیشدا هاتووە کە نابێ ئافرەت بەبێ (مەحرەم) سەفەر بکات. بۆیە دەبێ یانەکان چالاکی ئافرەتان تەنها لەناو وڵاتانی خۆیاندا بەکاربهێنن و، دووچاری شتێکیان نەکەن کە پڕیەتی لە دەردەسەریو ئابڕووچوون و شەرمەزاری.

## بۆندی دەست بەسەرداگرتن

(دکتۆر عەبدولعەزیم مەتعەنی)مامۆستای زانکۆی ئەزهەر لەگەڵ ئەم ڕاوبۆچوونانە کۆکەو، دەڵێ: بۆندی پیشەگەری لە بۆندە ئامادەکانە کە بریتییە لە سوود وەرگرتن لە لێهاتوویو پسپۆری یاریزانێك لە بەرامبەر بڕە پارەیەك بۆ یاریزان و یانەی بنەڕەتیو، کەسیش بۆی نییە بڵێ ئەم بۆندە حەرامەو، وەك ئەوە وایە ڕۆژنامەو دەزگا ڕۆژنامەگەرییەکان بۆند لەگەڵ گەورە نووسەراندا دەبەستن و ئەوانیش وتارەکانیان بۆ ئەو ڕۆژنامەیە دەنووسن لەبەرامبەر بڕە پارەیەکی زۆر، بۆیە دەڵێم بۆندی پیشەگەری وەرزشی حەڵاڵە... حەڵاڵە

بەڵام فرۆشتنی یاریزان (حەڵاڵ) نییە، چونکە دژایەتی کەرامەتی مرۆڤ دەکات. (د.مەتعەنی) ئاماژە بۆ ئەوەش دەکات هەندێ یانە زاراوەی (گرتنە خۆی یاریزان) یان (خوساتنی یاریزان) بەکاردێنن، جگە لە وانەش هیچی تر ڕاست نابێت.




## ڕاهێنەری بیانی

هەروەها (د. مەتعەنی) ڕەخنە لە پێدانی کرێی خەیاڵاوی بە پیشەگەرە بیانییەکان لە وڵاتە ئیسلامییەکاندا دەگرێت و دەڵێ ئەم کردارە زیانی هەیە نەك قازانج، چونکە ئەو ڕاهێنەرو یاریزانە پیشەگەرانە نە نوژدارن نە زانا تا خزمەتیان پێ بگەیەنن و کارەکە تەنها یاریکردنەو هیچی‌تر.

(د. مەتعەنی) سەرنج بۆ ئەمەش ڕادەکێشێ، کە دەبێ یاریزانی موسڵمان ڕەوشت و ئاکارێکی ئیسلامیانەی هەبێ تا وەکو ببێتە نموونەیەکی باش بۆ ئایین و نیشتمانەکەی‌و، دەبێ هەڵگری لێبوردەیی‌و خوڕەوشتی پاکی ئیسلام بێت و کەسانی دیکەش فێربکات. نابێ مەی بخواتەوەو بەدوای ئافرەتان بکەوێ‌و، دەبێ چوست وچالاك و دڵسۆزبێت لەکارەکەی‌و تەمبەڵی‌و تەوەزەلی نەکات. بەمەش نموونەیەکی چاك دەبێت بۆ بالوێزی وەرزشیمان لەدەرەوەدا.

## دژە ڕا

سەرەڕای هەموو ئەمانەی گوترا دەربارەی حەڵاڵی پیشەگەری وەرزشی (شێخ سەید وەفا) ئەمینداری گشتی کۆڕو مەجمەعی توژینەوە ئیسلامییەکان لە زانکۆی ئەزهەری پیرۆز لە دژی ئەم ڕایانە دەوەستێ‌و، گرێبەندی پیشەگەری بە (حەرام) دادەنێ، ڕوونیشی دەکاتەوە کە (ئیسلام هانی وەرزشی داوە بەمەبەستی تۆکمە کردنی لەش و لارو پتەوکردنی جەستە نەك بۆ بازرگانی‌و گیرفان پڕکردن).

هەروەها (سەید وەفا) دەڵێ: چالاکی یاریزان نەگۆڕ نییە بۆندیش پێویستی بەشتێکی چەسپاوو نەگۆڕ هەیە، بۆیە بەندەکە (بەتاڵ) دەردەچێت و، پیشەگەری دەرچوونە لە شەرع، چونکە یاریزان کەل و پەل نییە بکڕدرێت و بفرۆشرێت، گەر وەرزش سوودی ماددیشی تێدابێت ئەوا سوودەکە نادیارەو، ڕەنگە چالاکی یاریزانەکە وەکو خۆی نەمێنێ.

(شێخ سەید وەفا) ئاماژە بۆ ئەوەش دەکات کەوا گەرچی خۆی یاریزانێکی کۆنە، بەڵام شەرع ڕێگا بە پیشەگەری نادات و، (یاریزان) گوناهباری سەرەکییە لەم گرێبەندییە بەتاڵەدا.

## بۆندی نادیار نییە

جارێکی‌تر شێخ عەبدولعەزیم حومەیلی ئەندامی لێژنەی فەتوای ئەزهەری پیرۆز دەئاخڤێت و وەڵامی ئەمینداری گشتی کۆڕو مەجمەعی توێژنەوە ئیسلامییەکان دەداتەوەو دەڵێ: بۆندی پیشەگەری بۆندێکی نادیار نییە، چونکە بۆندێکی زانراوە لای پسپۆڕانی بواری وەرزشی چ لە ڕووی یاریزان یاخود یانەکەو، ئێستاکەش یانەکان سیستەمی تایبەتی لەم بارەیەوە دادەڕێژن و بیروبۆچوونەکانیان دەخەنە ڕوو، ئەمەش هیچ ڕێگرێکی لەبەردەمدانییە، بەڵکو دەبێ لە بۆندەکەدا جۆری کارو ئەنجامدانەکە دیار بکرێت و چەندایەتی هەفتانەو مانگانەو تاوەکو کۆتایی دیاری بکرێت گەر ئەمانە ڕوون بن، ئەوا بۆندەکە شەرعییەو بەنادیار داناندرێ. هەروەها ناوبراو پێی وایە هێنانی ڕاهێنەری بیانی شتێکی ئاسایی بێت بۆ سوود وەرگرتن لە تواناکانی، بۆیە دەبێ هەر ڕاهێنەرێك بەهاو ڕێزی خۆی هەبێت و، بوار لەبەردەم دەڵاڵە وەرزشییەکان دابخرێت.

بەڵام موسڵمانی یان غەیرە موسڵمانی ڕاهێنەرەکە پەیوەندی بە شێوازی بۆندەکە نییە، گەر زیانی نەبێت لە وڵاتی بەرامبەردا یانەکەش مافی ئەوەی هەیە بۆندەکە بلۆك بکات کاتێ هەست بەزیانە ئایینی و هەمە لایەنەکانی ڕاهێنەرەکە بکات.

ژێدەر: گۆڤاری (الوطن الریاضي)، هاوینی ٢٠٠١.





# کێ کۆبوونەوەی سیاسی ئیسلامی (خۆشەویستیو باوەڕی) دامەزراند

ئا: فاتیح یاسین مودەریس

مادامەکی کۆمەڵگەی ئیسلامی لەسەر ڕێسایەکی باوەڕ دامەزراوە، سروشتییە کە خۆشەویستی خودا بنەماو بناغەی باوەڕەکە بێت، چونکە تەنیا بە (اشهد ان لا اله الا الله واشهد ان محمد رسول الله) خۆشەویستی پەروەردگارو ئیمانداران لەدڵی مرۆڤ دەچەسپێو بێ باوەڕانی خۆش ناوێت لە هەر کوێیەکابن. بۆیە پێغەمبەری خۆشەویستمان(د.خ) ڕۆژێکیان بە یارانی فەرموو: دەزانن تەواوی باوەڕ لە چیدایە، یاران وەڵامیان دایەوەو گوتیان: تەنیا خوداو پێغەمبەری خودا(د.خ) دەزانن. پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: (خۆشەویستی پەروەردگار)، هەروەها فەرمووی: (باوەڕ تەوا نابێت تا موسڵمان خواو پێغەمبەری وەك یەك خۆش نەوێت).

جا تەنیا بە (اشهد ان لا اله الا الله واشهد ان محمد رسول الله) مرۆڤ دەبێتە بەشێك لەنەتەوەی ئیسلام کە ناخی لەمێژوودا چەسپاوە. ئیسلام نەتەوەیەکە کات و شوێنی بۆ دیارنەکراوەو نازانێ. هەر موسڵمانێك بەگوێرەی ئەو ئایەتە پیرۆزە، دەبێتە وەڵامێك و بەڵگەیەك بۆ ئەو کەسانەی نکۆڵی لەپێغەمبەرایەتی محەممەد(د.خ) دەکەن کە دەفەرمووێت: ﴿**قُولُوا آمَنَّا بِاللَّهِ وَمَا أُنْزِلَ إِلَيْنَا وَمَا أُنْزِلَ إِلَى إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَالْأَسْبَاطِ وَمَا أُوتِيَ مُوسَى وَعِيسَى وَمَا أُوتِيَ النَّبِيُّونَ مِنْ رَبِّهِمْ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِنْهُمْ وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ**/ سورة البقرة-١٣٦﴾ چونکە ڕێگەی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەران دەربارەی موعجیزەی پەروەردگارە لەسەر دەستی ئەوان. کاتی موعجیزە لەسەر دەستی محەممەد(د.خ) دەرکەوت ئەوا لەسەرمان واجب دەبێت دان بەپێغەمبەرایەتییەکەیدا بنێین و ملکەچی پەیامەکەی بین. جا ئەگەر هەندێ تایبەت بکەین بەوەی باوەڕمان پێ هەبێت و هەندێکی دیکە ڕەتبکەینەوە، بەپێی بەڵگە.. (ئەقڵ) بەوە ڕازی نابێت. بۆ نموونە دەبێت لەپێش هەموو شتێکدا باوەڕت بەخودای تاك و تەنیا هەبێت ئینجا بەکتێب و پێغەمبەرەکان، چونکە باوەڕبوون بە پەروەردگار بناغەی باوەڕە بە یاساو شەریعەت و پەیامەکەی، جاگەر یەکێك خوا نەناسێت ئەوا مەحاڵەو هەرگیز باوەڕی بە کتێب و پێغەمبەرەکان هەبێت و بیانناسێت.

مرۆڤ تەنیا بە شەهادەت هەست دەکا بەشێکە لەنەتەوەی ئیسلام، ئەو هەستە خۆشەویستییەی بۆ موسڵمانێکی سەر ئەو زەوییە دەچێت. هەر بەهۆی ئەو شەهادەتەوە مرۆڤ هەست دەکا کە لەو گەردوونەدا دەژیو هۆگری دەبێ، چونکە ئەو گەردوونە دەستکاری پەروەردگارەو ملکەچە بۆ سوپاس و ستایشی خودا، هەروەکو پێغەمبەر دەربارەی کێوی (ئوحد) فەرموویەتی: (**هذا جبل يحبنا ونحبه**).

خۆشەویستی بناغەی یەکبوونە، گەر مرۆڤ شتێکی دیکەی لەگەڵ خودا خۆشبووێت




ئەوا بناغەی هاوتایی دەگەیەنێت. لەمبارەیەوە (ئیبنول قەییم) گوتویەتی: جیاوازی کردن لەنێوان ئەو دوو جۆرە خۆشەویستییەی خستمانە رووگرنگترین شتە کە دەبێ مرۆڤی موسڵمان دەرکی پێبکات.

خۆشەویستی خودا تەواکاری باوەڕە، بەڵام خۆشەویستی شتی دیکە لەگەڵ خودا هاوتایی لێ دەکەوێتەوە، چونکە هەریەکەو شوێن کەوتووی خۆشەویستییەکەیەتی. جاهەر کەسێك خوای خۆی خۆش ویست، ئەوا ئەوانەشی خۆش دەوێ، کە خودا خۆشی دەوێن و لەسەری واجب دەبێت خۆشیانی بوێت وەکو خۆشەویستی پێغەمبەران و فریشتەو ئەولیایەکان و ئیمانداران، دەبێ لەو کارانەش دووربکەوێتەوە، کە خوا دەفەرمووێ لێی دوور بکەونەوە.

ئایین هەمووی لەدەوری ئەو چوار رێسایە کۆدەبێتەوە (خۆشەویستیو دوورکەوتنەوە.. کە کارپێکردن و پێ نەکردنی لەدواوە دێت). جا ئەگەر هات و مرۆڤ کاری بەو رێسایانە کرد بەوەی کە خوا خۆشی دەوێن، هاوکات ئەو کارانەشی بەلاوەنا کە خوا فەرموویەتی نەیکەن و خۆتانی لێ دوور بخەنەوە. ئەوا بەوەوە باوەڕەکەی جێگیر دەبێ‌و تەواو دەبێت. بەڵام گەر خوانەخواستە یەکێك بەهەڵەداچوو، ئەوا خوای گەورە دەرگای تۆبەی بۆ کردۆتەوە کە لەهەڵەکەی پەشیمان بێتەوەو تۆبەی راستەقینەی لەسەر بکات. هەمدیس لەکاتێکدا ئەگەر هات و مرۆڤ شتێکی لەجێبەجێ کردنی ئەو چوار رێسایانە کەمکردەوە ئەوا کەم و کوڕی لەئایین و باوەڕەکەی دەکەوێتەوە پێچەوانەی خۆشەویستی خواش دوو جۆرن: یەکەمیان (هاوتاییە) واتە بت و سەنەم و نموونەی ئەوانە لەگەڵ خوا دەکاتە هاوتاو خۆشیانی دەوێت، ئەمەش جێگەی مەترسییەو پێویستی بەپەشیمان بوونەوەو پاڕانەوەو نزاکردن هەیە. دووەم: خۆشەویستی ئەو شتانەیە کە پەروەردگار لەدڵ و نەفسی مرۆڤ جوانی کردوون وەك ئافرەت و منداڵ و زێڕو زیو... هتد. جا خۆشەویستی هەندێ شت لەوانە خراپ نییەو مرۆڤ پێی تاوانبار نابێت مادامەکی وەك خواو لەخوای زێتر خۆش ناوێت، ئەم خۆشەویستییەش کارێکی سروشتییە کە پەروەردگار هەر لەدەستپێکردنی خوڵقاندنی مرۆڤ لەگەڵی دروستکردووەو کار لەباوەڕەکەی ناکات. بەڵام بەپێچەوانەی ئەوە کە بەمەبەست ئەوانەی خۆشبووێت و هەوڵ و کۆششی بۆ بدات بەدوور لەو رێسایانەی پەروەردگار بۆ مرۆڤ دایهێناوە، ئەوا کارێکی خراپەو لەباوەڕەکەی کەم دەکاتەوەو ئەو کات بەزاڵمی نەفسی خۆت و بەدواکەوتنی شەیتان و حەزو ویستەکانت گوزارشت دەکرێت. بۆیە پێویستە ئێمەی مرۆڤ بەتایبەتی ئێمەی ئیمانداراو موسڵمان بەتەواوی‌و بەوردی لەم جیاوازیانەی نێوان خۆشەویستی خواو خۆشەویستی دیکە ورد ببینەوە کە نێگەتیڤی کار لە کردەوەکانمان دەکات و لەپاشەرۆژدا زیانمان پێ دەگەیەنێت.

بەمەوە بۆمان دەردەکەوێت کە پێغەمبەری خۆشەویستمان محەممەد(د.خ) دامەزرێنەری یەکەمی کۆبوونەوەی سیاسی ئیسلامی (خۆشەویستیو باوەڕە.

**ژێدەر:**


١. تەفسیری رەوان-بەرگی یەکەم-ن/ مەلا مەحمود گەلاڵەیی، ١٩٩٧.
٢. رۆژنامەی (الحیاە)، ژ ١٣٤٩٣.
٣. سورەتی (البقرة)، ئایەتی ١٣٦.




# کارتێکرنا جگاریێ لسەر جڤاکیێ

جگەرسۆز پێندرۆیی

جگارە ئێشەکا کوشندەیە د ناڤ کەلەخێ جڤاکێدا و گەلەك کار تێکرنێن نەرەندو نەژهەژی ل سەر کەت وکوم وتەخێن جڤاکێ دهێلیت، لەورا مە ب فەر زانی دڤی بابەتێدا تبلا خوە داینە سەر کۆمەك ژ زیانێن جگاریێ کو ژ زۆر ئالیاڤە کار تێکرنەکا نکتیڤ ل سەر ژیانا خەلکی چێدکەت.

گرنگترین ئەوخالێن ئەم ل سەر د پەیڤێن و دئێخین بەر چاڤێن خوێندەڤانان ئەڤێن خارێنە.

١-زیانێن جگاریێ بو ساخلەمیا لەشی.

٢-زیانێن جگاریێ بو مالباتێ.

٣-زیانێن جگاریێ یێن ئابۆری.

٤-زیانێن جگاریێ یێن جڤاکێ.

٥-زیانێن جگاریێ یێن ژینگەهێ.

٦-هەلویستێ ئولێ ئیسلامێ هەمبەر جگاریێ.

١. زیانێن جگاریێ بو ساخلەمیا لەشی: ل دیڤ وا هەلشکاڤتن ولێڤەکولینێن نوژداری خویا بوویە کو جگارە ژێدەرەکێ بوشێ چەندین ئێشایە و بو ساخلەمیا کەسێ جگارکێش زۆرا پڕ مەترسییەو گەلەك جارا ژی ژبەر ڤان ئێشا خەلکەکێ زۆر جانێ خوە ژ دەست داینەو زۆر ژی ب سەدەما جگاریێ دووچاری نەساخیێن دوم درێژ (مزمن) بووینە.

ئەو ئێشێن ژ جگاریێ سەر هەلددەن گەلەکن لێ پرانیا وان د کارێن بڤێ تەرتیڤێ رێز بەندی بکەین.

سەدەمە بۆ چێبوونا چەندین رەنگێن شیر پەنجێ، کارتێکرنا هەی ل سەر هەوبوونا بورپیا هەناسەدانێو نەساخیێن سیپەلکا، کارتێکرانا هەی ل سەر نەساخیا شەکرێ، سەدەمە بو زێدەبوونا گوشارا خوینێ، ئەگەرەکا ب هێزە بو کول بوونا دەڤیو خراپ بوونا ددانا، کاریگەریا هەی ل سەر نەساخیێن مێلاکێ، گەدێ دووچاری کولبوونێ دکەت و هتد.لەورا نوژدار زۆر ب مجتی د شیرەت و راسپاردێن خوەدا تێکەس دکەن کو بتنێ چارەسەر بو تەشەنە نەکرنا نەساخیێن ناڤبریو چارەسەرکرنا وان خوەبپاراستنە ژ جگاریێ.

٢. زیانێن جگاریێ بو مالباتێ: پرانیا ئەو مالباتێن کەسەك یان چەند کەس جگاریێ تێدا دکێشن ل سەرخەزینا مالباتێیەو مافێ هەمی ئەندامێن مالباتێ مینا هەڤ ناهێتە پاراستن و داد پەروەری ناهێتە لبەر چاڤ گرتن

## جگارە ئێکە ژ سەدمێن پیسکرنا ژینگەهێ





هەروەسا کەسێن جگارەکێش دێ بۆ ئەندامێن دی یێن مالباتێ بنە پێشەنگ ومیناکێن خراپ نەمازە بو زارۆکێن مالباتێ ژ بەر کو ئەو پتر ب کارێن کەسێن ژخوە مەزنتر داخبار دبن وشۆیا چاڤلێکەریێ هەلدبژێرن، هندەك جارا ژی جگارە دبیتە سەدەما چێبوونا هەڤرکیێ دناڤبەرا ئەندامێن مالباتێدا.

٣. زیانێن جگاریێ یێن ئابۆری: هەلبەت یا خویایە ئابۆری شەنگستەکێ موکمێ

ئەڤ دراڤێ برێکا جگاریێ ڤە رۆژانە دهێتە مەزاختن دێ ئابۆری لاوازکەت

ژیانێیە نەمازە دڤی سەردەمیدا، ژبەر کو جیهان ب سەدەما شۆرەشا زانستی وئابۆری کاریە بگەهیتە ڤان ئافراندن و دەستکەڤتێن مەزن، ڤێجا دڤێت کەت و کۆمێن جڤاکێ پێکۆلێ بکەن. بناغەکێ تاقەت بۆ ئابۆریێ خوە دارێژن دابکارن ژ ئەڤ ئالاڤە پێشڤە بچن و سەربکەڤن. ناهێتە ماندەل کرن جگارە ئێکە ژ هرفینەرێن کۆکا ئابۆری و کار تێکرنێن ئەرێند ل سەر رەوشا ئابۆری دهێلیت لسەر ئاستێ کەسیو مالباتیو جڤاکی ژ بەر کو ئەڤ دراڤێ برێکا جگاریێ ڤە رۆژانە دهێتە مەزاختن، دهێتە شەوتاندن و ناڤەزڤریتەڤە ڤێجا رژد بوون ل سەر کێشانا جگاریێ دێ ژ مێرانا ئابۆری کێمکەتەڤەو لاواز کەت.

٤. زیانێن جگاریێ یێن جڤاکی: هەر کەسەك ژمە ئەندامەکە ژ جڤاکا مەزن، لەورا دڤێت لدیڤ شیان و ژێهاتنا خوە پێکولا پاراستنا ساخلەمیا جڤاکێ خوە بکەین وپشکداربین دپرۆسێ پێشڤەڤە برنا جڤاکێدا.

جگارە ئێکە ژوا دەردێن دووچاری جڤاکێ هاتی ژ بەر کو رۆژانە هزاران دینار ژ ئالێ ئەندامێن جڤاکێ ڤە دهێنەسۆتن و ژناڤبرن، ئەگەر ئەڤ دراڤە دناف قاسەکا تایبەتیدا بهێنە هەلگرتن ئەم دکارین سالانە ب هزاران کەسێن برسی تێربکەین هەڤکاریا مالباتێن دەست تەنگ بکەین و دەستێ دلۆڤانیێ برێکا هەڤکاری و هەڤسۆزیێ ب سەرێ زارۆکێن بێ باب و دایك و بێ سەخبێر دابینین، زێدە باری چێکرنا چەندین پرۆژێن خێری.

٥. زیانێن جگاریێ یێن ژینگەهی: پاراستنا ژینگەهێ ئەرکەکێ پیرۆزە ل سەر ملێن هەمی تەخێن جڤاکێ ژبەر کو ژینگەهێ هەڤبەندیەکا ئێکسەر ب ژیانا هەر کەسەکی ڤە هەیە، ئانکو ژینگەهـ چەند یا پاقژو ساخلەم بیت جڤاك ژی هند دێ یاساخلەم و پاقژ بیت، بەرۆڤاژی ڤێ چەندێ ژی تڤاف راستە،ئانکو ژینگەهـ چەند یا پیس و هەرمەتی بیت جڤاك ژی دێ هندیا خودان ئاریشەو نەساخی بیت.

جگارە ئێکە ژ سەدەمێن پیسکرنا ژینگەهێو رۆژانە سەدان هزار کەتێن جگارا دبنە کادیو دویکێل و ئەسمانێ زەلالێ وەلاتێ مە پێ پیس د بیت و سەقایێ پاقژێ وێ تەمەدی دبیت، ئەڤێ چەندێ ژی کیم ئان زۆر کارتێکرن بو سەر ژیانا تەڤایی هەنە.

٦. هەلوێستێ ئۆلێ ئیسلامێ هەمبەر جگاریێ: ئول ئیسلامێ بەرنامێ ژیانێیەو رێبازا سەرفرازێیە ڤێجا دهەمبەر هەر ئاریشەکا سەر هەل دابیت ئان سەر هەل بدەت یا کرو بێ هەلوێست نەبوویە بەلکو هەم حوکمێ وێ دیار کریە هەم




# زێدەگاڤیێ نەکەن، ئەوێن زێدەگاڤیێ دکەن براکێن شەیتانییە

چارەسەری ژی ژێراڤە دیتیە، جگارە ئێکە ژوان تشتێن دڤان چەند سەد سالێن دیماهیێ دناڤ وەلاتێن ئیسلامی ژیدا پەیدا بووی و هەتا نها ژی هەرا بەردەوامە، لەورا زانایێن ئوولێ لدیڤ شەنگستێ (قیاس) حوکمێ ئوولێ ئیسلامێ لدۆر کێشانا جگارێ بو گەلێن مسلمان دیار کریە و ژوا ناخاستیە پێگریێ پێڤە بکەن.

پرانیا زانایێن ئوولێ ئەوێن شارەزاو ژێزان جگارێ ب تشتەکێ نە دروست و پیس و حەرام دزانن بوڤێ چەندێ ژی گرۆڤێن قورئانا پیرۆزو سونەتا پێغەمبەرێ مە سلاڤێن خودێ لسەر بن ددست دانە کو ئەم ب باش دزانین ئاماژێ ب هەندەک ژوان بەلگەو گرۆڤا بکەین.

١. قورئانا پیرۆز ل سورەتا ئەعرافێدا دبێژیت: ﴿وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَائِثَ/ سورة الاعراف-١٥٧﴾ ئانکو خودێ بو هەوە تشتێ باش و پاقژ حەلال دکەت و تشتێ پیس و نەژهەژی حەرام دکەت ڤێجا جگارەژی ژ تشتێن پیس دهێتە هژمارتن ژ بەر ئەو زیانێن ناڤبری.

٢. قورئانا پیرۆزل سورەتا بەقەرەدا ئایەتا ١٩٥ێ دبێژیت: ﴿وَلاَ تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ﴾ ئانکو هنگ خوە بدەستێ خوە ناهاڤێنە هیلاکەتێ جگارەژی ئێکە ژوان تشتێن مرۆڤی دبەت بەرەف خوە کوشتنا هێدی هێدی(تدريجى).

٣. قورئانا پیرۆز ل سورەتا ئیسرادا ئایەتا(٢٦-٢٧)ێ دبێژیت:﴿وَلاَ تُبَذِّرْ تَبْذِيراً* إِنَّ الْمُبَذِّرِينَ كَانُوا إِخْوَانَ الشَّيَاطِينِ﴾ ئانکو دەمەزاختنێدا زێدە گاڤیێ نەکەن ژبەر کو ئەوێن زێدە گاڤیێ دکەن براکێن شەیتانییە، جگارە ژی ئێکە ژوان تشتێن کو هەمی دبیتە زێدەگاڤی و ئیسراف د مالیدا.

٤. پیغەمبەرێ خودێ سلاڤێن خودێ لسەربن دبێژیت: (لاضرر ولاضرار) ئانکو دئیسلامێدا چێنابیت نەزیانێ بگەهینیە خوە نەبگەهینیە کەسەکێ دی، هندی جگارەیە هەم زیانێ لتە دەت هەم زیانێ دگەهینیتە کەسێن دیژی.

**چارەسەری:** بو مرۆڤەکی ئولدارو تێگەهشتی ئەڤ بەلگەو گرۆڤێن ناڤبری بەسن کو ب بیرو باوەرەکا موکم ڤە برپارا خوەیا دیماهیکێ بدەت و پشتا جگارێ ژ عەردی بدەت بەری جگارە پشتیاوی ل عەردی بدەت،

هەر وەسا دڤێت ئەو پتر هەست ب بەرپرسیاریەتیا خوە بکەت دهەمبەر خوەو مالباتا خوەو جڤاکێدا ژی وەپیکولێ بکەت مرۆڤەکی ساخلەم بیت بو جڤاکێ و پێشەنگەکێ ئەرینی (ایجابى) بیت بو کەسێن دیژی، هەروەسا شەڤێ بکەتە رۆژ بو نەهێلانا دابیش و ئاریشەو پرسگرێکێن جڤاکێ بو ڤێ چەندێ ژی یافەرە پێنگاڤا ئێکێ ژ خوە دەست پێبکەت.

ژێدەر:

قورئانا پیرۆز





# گەشتێك بەناو مزگەوت و تەكیەكانی شاری هەولێر

**فەرهاد عەبدوڵلا**

زۆر لەو رەوشتە بەرزانەی كە هەن كورد هەڵیگرتووەو لێی جیانابێتەوە لەمانەش (وەفاداری)، هەر لەسەرەتای پابەندبوونی كورد بەئایینی پیرۆزی ئیسلامەوە بەوپەڕی دڵسۆزی و وەفاداری پاراستویەتی و خۆی لەپێناویدا بەخت كردووە، هەردەم لەشارو لەدێ خۆی بەعیبادەت و زیكر و خواپەرستی خەریك كردووە، بۆ ئەم مەبەستەش بەر لەدروست كردنی خانووبەرە بۆ حەوانەوەی ماڵ و منداڵی دەستی كردووە بە بنیات نانی مزگەوت و قوتابخانەی ئیسلامی و تەكیەو خانەقا، پارێزگای هەولێریش لەم ناوچە دێرینانەیە كە بەر لە زۆر شوێنی تری ئەم كوردستانە جێگای عیلم و زانستی ئیسلامی بووەو زۆر لە مامۆستای ئایینی و شێخی تەریقەت و پیاوچاكی لێ هەڵكەوتووە، كە توانیویانە بەدەیان مزگەوت بكەنە قوتابخانەو حوجرە بۆ بڵاوكردنەوەی زانست و خوێندنی ئیسلامی و پەرەپێدانی مێژوو و ئەدەبی گەلەكەیان.

جا بۆ ئەوەی كە لە رۆژانێكی وەك ئیمڕۆو وەك وەفاداریەك بۆیان



لە بلاوكراوەكانی
حكومەتی هەرێمی كوردستان
وەزارەتی ئەوقاف و كاروباری ئیسلامی
ژمارە (١١)

گەشتێك بناو
مزگەوت و تەكیەكانی
شاری هەولێر

عمر شیخ لطیف بەرزنجی

پێویستە لەسەرمان بەردەوام یادیان بكەینەوەو شارەزاییمان هەبێت لە كردەوەو هەوڵ و كۆششەكانیان، بێ گومان بۆ ئەم مەبەستەش دەبێ مێژووی ئەم شوێنانە بخوێنینەوە كە زانایان لە رۆژانی رابردوو تیایدا بوون بە مۆم و چوار دەوری خۆیان پێ روناك كردۆتەوە، هەڵبەت ئەم شوێنە پیرۆزانەش مزگەوت و تەكیەو خانەقاكانن.

ئەوەی دەمەوێ لێرەدا ئیشارەتی پێ بدەم ئەم پەرتوكە بەنرخەیە لەژێر ناوی (گەشتێك بناو مزگەوت و تەكیەكانی شاری هەولێر) كە لە بڵاوكراوەكانی وەزارەتی ئەوقاف و كاروباری ئیسلامیەو دانەرەكەی بەڕێز (عومەر شێخ لەتیف بەرزنجی)یە كە لە (٤١٦) لاپەڕە پێك دێت و باس لە مزگەوت و تەكیەو خانەقاكانی سنوری پارێزگای هەولێر دەكات و لە چوار بەش پێك هاتووە، لە بەشی یەكەمدا مێژووی (٢٠٣) مزگەوتی بەنووسینێكی رێك و پێك دارشتووەو، لەبەشی دووەمیشدا باسی (١٤) جێ نوێژی (مصلی) كردووەو، لەبەشی سێیەمیشدا باسی لە مێژووی (٢٥) تەكیە دەكات، لە كۆتاییشدا (٣) خانەقای بەدرێژی باس كردووە.

لەلایەكی تر نووسەر بەهەوڵ و بە كۆششێكی زۆر توانیویەتی زۆر لە وێنەی ئەم مزگەوت و تەكیەو خانەقایانە بخاتە سەر لاپەرە قەشەنگەكانی كتێبەكەی كە بەراستی وێنەی دەگمەنن.

لەكۆتاییدا وێرای دەست خۆشی لە نووسەری بەڕێز لە خوای گەورەش بەردەوامی بۆ دەخوازین بۆ هەڵسان بەهەمان كار لە شوێنەكانی دیكەی كوردستان تاكو بەم كارەی چاكترین و بەكەڵك ترین سەرچاوە لەم بوارەدا بۆ داهاتوومان دابین بكات.






# لەدادگای تەمییزی هەرێمی کوردستانەوە

ئا/ مافپەروەر: سیروان ئەحمەد

**زنجیرە بڕیارێکی دادگای تەمییزی هەرێمی کوردستانە، گۆڤارەکەمان لە هەموو ژمارەیەکیدا دوان لەو بڕیارانە وەردەگێڕێتە سەر زمانی کوردی کە پەیوەستن بەئەوقاف و مەسەلە شەرعییەکانەوە، ئەم کارەش هەنگاوێکی بەراییانەیە لەرێگەی بەکوردی کردنی یاسا.**

دەستەی گشتی دادگای تەمیزی هەرێمی کوردستانی عێراق لەرێکەوتی ٢٤/١٢/٢٠٠١ بەسەرۆکایەتی بەڕێز رەشید عەبدولقادر سەلیم و ئەندامیەتی بریکاری سەرۆک بەڕێز محەممەد سالح سەعیدو دادوەران بەڕێز جەلال زێوەر عومەرو عەزیز عەبدوڵلا ئەحمەدو دکتۆر




**محەممەد عومەر مەولودو سەلاح ئەحمەد یەعقوبی و ئەحمەد عەبدوللا زوبێر پێکهات، کە ڕێپێدراون بەناوی گەلەوە دادوەری بکەن، ئەم بڕیارەیان دەرکرد:**

**تەمیزکاران/ تێهەڵچووەوە لەسەریان ١ـ و، ٢ـ ع**
**تەمیز لەسەر کراوان/ تێهەڵچووەوەکاران١ـ ر، ٢ـ م**

لێناڕازی کەسی دی/ ر سەرەڕای فەرمانبەریەتی لای دادگای بەرایی هەولێر بانگەشەی ئەوەی کرد کە لەڕێکەوتی ١٩٩٩/١٢/٣٠ دادگای ناوبراو حوکمێکی بەئامادە بوونی هەردوولا دەرکردوە بە ژمارە ٩٣٠/ب/٩٩٩/٢،ئەم حوکمەش زیان و دەست درێژی کردۆتە سەر مافەکانی (ر)، چونکە تیایدا هاتووە کە موڵکی ٣٨٤/بازاڕ تەسلیم بەداواکار لێناڕازی کەسی دی یەکەم/ع سەرەڕای تەولیە بکرێت ئەوەی ناوبراو خاوەنی موڵکی ناوبراو بێت چونکە لەلایەن (ر)ەوە خۆماڵەکراوە، بەپێی ئەو حوکمەی لەدادگای بەرایی هەولێرەوە دەرچووە بە ژمارە ٩٧٧/٣١٦ لە ٩٧٩/٢/٤. حوکمی سەرەوەش جێبەجێ کراوە بەتۆمارکردنی موڵکی ژمارە ٣٨٤/بازاڕ بەناوی (ر)ەوە لای بەڕێوەبەرایەتی تۆمارکردنی خانووبەرە بەهەردوو ژمارەی ١١٩,١١٨ مارس ٨٣ تۆماری ٢٥٩ لە ٩٨٤/٦/٤. لەبەر ئەوە داوای کرد بڕیارێك دەربکرێت بەراگرتنی ڕێو شوێنەکانی جێبەجێکردن لە فایلی ژمارە ٢٩٢/٢٠٠٠ی تایبەت بە جێبەجێ کردنی حوکمە ڕەخنە لەسەر گیراوەکە تا ئەنجامی دەعواکەو بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێ کردنی هەولێریشی لێ ئاگادار بکرێتەوە، حوکمە ڕەخنە لەسەر گیراوەکەش پوچەڵ بکرێتەوەو، دەعوای داواکاریش ڕەت بکرێتەوەو قەیدی ژمارە ٤٣/حوزەیران/ ٩٩٨یش پوچەڵ بکرێتەوە کەبەپێی ئەوە موڵکەکە بەناوی خاوەنەکەی تۆمارە، ئەویش بەپێی قەیدی پێشوو بەر لە خۆماڵە کردنەکە، چونکە قەیدی ژمارە ٩٦٣ژمارە ١٢ژمارەی بەرگ ١٤٥ لەجیاتیاندا هەردوو قەید١١٩,١١٨هەیە تۆماری ٢٥٩ لە ٩٨٤/٦/٤وە هەموو ئەو قەیدانەش لەدوای هەردوو قەیدی ناوبراو هاتوون، کە بەگوێرەیان موڵکەکە بەناوی (ر) تۆمارە پوچەڵەو لەیاسادا پاڵپشتێکی نییە، لێناڕازی کەسی دیکەش هەموو خەرجییەکانی بکەوێتە ئەستۆ.

دادگای ناوبراو لەڕێکەوتی ٢٠٠١/٦/١ وە بەژمارە ٩٣٠/لێناڕازی کەسی دیکە/ ٩٩٩ حوکمێکی بەئامادەبوونی هەردوولا دەرکرد، کە ناڕەزاییەکە ڕەت دەکاتەوەو ئەوحوکمەش کە لەهەمان دادگاوە دەرچووە بەڕێکەوتی ٩٩٩/١١/٣٠پەسەند دەکات لەگەڵ قبوڵ کردنی هەردوو ئەو (تظلم)ەی تایبەتە بەراگرتنی ڕێوشوێنەکانی جێبەجێ کردن لەو خاڵەوەی کەلێوەی ڕاوەستاوە، دوای ئەوەی حوکمەکەش دوا پلەی وەرگرت، لێناڕازی کەسی دیکەش خەرجییەکان و ماندوو بوونی پارێزەرایەتی بکەوێتە ئەستۆ بۆ هەردوو بریکاری لێناڕازی لەسەر گیراوانی کەسی دیکە بە بڕی (٦٠٠) دینار بەیەکسانی لەنێوانیاندا. هەریەکە لە بریکارانی لێناڕازی کەسی دیکە بەحوکمەکەی سەرەوە هەڵچوونەوە لای دادگای تێهەڵچونەوەی ناوچەی هەولێر داوایانکرد هەڵبوەشێتەوە، لەبەر ئەو هۆیانەی لەعەریزەکانیاندا هاتبوو لە هەردوو ڕێکەوتی ٢٠٠٠/٦/٦و ٢٠٠٠/٧/١٧ دوای ئەوەی دادگای تێهەڵچوونەوە بڕیاریدا یەکیان بخات و بەیەك شێوە سەیریان بکات لە دەعوا تێهەڵچوونەوەکەدا بەژمارە ٢٦/س/٢٠٠٠، لە





دانیشتنی ڕێکەوتی ١١/٩/٢٠٠٠ بڕیاریدا دەعواکە دوا بخرێت بەپاڵپشتی ئەوەی یەکلاکردنەوەی ئەم دەعوایە لەسەر دەرچوونی حوکمی کۆتایی ڕاوەستاوە لەو دەعوا تاوانییەی کە دادگا هێناویەتی. لە ئەنجامی ئەو تانە تەمیزییەی لەبڕیاری سەرەوەشدا هاتووە لەلایەن بریکاری لێناڕازی کەسی دیکەو بریکارانی لێناڕازی لەسەر گیراوانی لێناڕازی کەسی دیکە، ئەم دادگایە بڕیاریدا، بەپێی بڕیارە تەمیزیەکەی کەلە ڕێکەوتی ٣٠/١٠/٢٠٠٠ دەرچووە بەژمارە ٢٥٠/ دەستەی تێهەڵچوونەوەی مەدەنی ٢٠٠٠/ بڕیارە تەمیز کراوەکە هەڵبوەشێتەوەو دەعواکەش بگەڕێتەوە دادگاکەی خۆی تا لەو خاڵەوە دەست پێبکاتەوە کە ڕاوەستاوە. دوای گەڕانەوەی دەعواکە بۆیو سەر لەنوێ بەڕێکردنەوەی دادبینیەکە، دادگای تێهەڵچوونەوە حوکمێکی بە ئامادەبوونی هەردوولا دەرکرد، کە دەکرێت تەمیز بکرێتەوە لە ڕێکەوتی ٨/٥/٢٠٠١و بە ژمارە ٤٦/س/٢٠٠١ کەپشتگیری لە حوکمە بەراییەکە دەکات، کەلە دەعوای ژمارە ٩٣٠/ لێناڕازی کەسی دیکە/٩٩ لە ١/٦/٢٠٠١ دەرچووە، لێناڕازی کەسی دیکەش خەرجییەکان و ماندوبونی پارێزەرایەتی بکەوێتە ئەستۆ. لەئەنجامی تانەی تەمیزی لەحوکمەکەی سەرەوە لەلایەن بریکاری تێهەڵچووەوە /لێناڕازی کەسی دیکە ئەم دادگایە لە ڕێکەوتی ٢٩/١/٢٠٠١و بەژمارە ١٢٦/دەستەی تێهەڵچوونەوەی مەدەنی/ بڕیارێکی دەرکرد بەپەسەند کردنی حوکمەکە. لەبەر ئەوەی تێهەڵچووەوە/ لێناڕازی کەسی دیکە بەبڕیارە تەمیزیەکەی سەرەوە قەناعەتی نەهات داوای ڕاست کردنەوەی کرد لەبەر ئەو هۆیانەی لەعەریزەکەو پاشکۆکەیدا هێناویەتی بە هەردوو ڕێکەوتی ١و٢/٧/٢٠٠١. دەستەی گشتی ئەم دادگایە بەژمارە ١٦/دەستەی گشتی /٢٠٠١لە ٩/٧/٢٠٠١ بڕیارێکی دەرکرد بە قبوول کردنی ڕاست کردنەوەکە، بەشێوەیەك تیایدا هاتووە، لەبەر ئەوەی ئەو مەرجانەی تێدایە کەلەماددە ٢١٩ی یاسای دادبینی مەدەنی هەیە، بڕیاردرا ڕاست کردنەوەی بڕیارە تەمیزییەکە قبووڵ بکرێت، کە لەرێکەوتی ٢١/٦/٢٠٠١ دەرچووە بەژمارە ١٢٦/دەستەی تێهەڵچوونەوەی مەدەنی/٢٠٠١ بەشێوەیەك ڕوون بۆتەوە، کە موڵکی ژمارە ٣٨٤/بازاڕ خۆماڵە کراوە لەلایەن (ر)ەوە بەپێی بڕیاری دادگای بەرایی هەولێر بە ژمارە ٣١٦/٩٧٧ لەرێکەوتی ٤/٣/٩٧٩ بڕیاری خۆماڵە کردنەکەش جێبەجێ کرا بەتۆمار کردنی موڵکی ناو براو بەناوی (ر)ەوە، بەپێی قەیدی ژمارە ٩١/ئازار ٩٨٣ بەرگ ٢٥٩ دواتر موڵکی سەرەوە جیا کراوەتەوە بۆ دوو پارچە، ئەوانیش: پارچە زەوی ژمارە١/٣٨٤ کە بۆ ڕێگەی گشتی ڕۆیشتووەو ٢/٣٨٤ کە زەوی خانووەکەیە لەگەڵ بیناکانیدا ئەویش بەپێی هەردوو قەیدی ژمارە ١١٨و ١١٩ ئازار ٩٨٣بەرگ/٢٥٩، هەریەکە لە مانەش لە نووسراوی بەڕێوەبەرایەتی تۆمارکردنی خانووبەرە لە هەولێر هاتووە بەژمارە ٦٤٧٨ لەرێکەوتی ٢٩/٤/٢٠٠٠ بۆ زانین ئەم زانیاریانە لای ئەم دادگایە شاراوە بوون لەکاتی دەرچوونی بڕیارەکەی بە ژمارە ٤/دەستەی گشتی/٢٠٠٠ لەرێکەوتی ١/٣/٢٠٠٠ لەبەر ئەوە هەڵسانی لێناڕازی لەسەری یەکەم بە سەرلەنوێ تۆمارکردنەوەی موڵکەکە بە ناوی خۆیەوە بە پێی قەیدی ژمارە ٤٣/حوزەیران ٩٩٨پاڵپشت بە قەیدی پێشوو ١٢/نیسان ٩٦٣هەروەها تۆمارکردنی وەسیەتەکە، لەسەر ئەوە ناکرێت بەپێی یاسا پێی وەربگیرێت و لەرووی یاساییەوە هیچ نرخێکی نییە، چونکە موڵکی ناوبراو بۆتە موڵکی (ر)و




کەسی تر بۆی نییە هەڵس وکەوتی پێوە بکات لەبەر ئەوە بڕیاردرا حوکمە تێهەڵچووەکە بە ژمارە ٤٦/س/٢٠٠٠ لەرێکـــــــــــــەوتی ٢٠٠١/٥/٨ هەڵبوەشێتەوە کە پاڵپشتی لە حوکمە بەراییەکەی ژمارە ٩٣٠/ لێنارازی دیکە/٩٩٩ لە رێکەوتی ٢٠٠١/٦/١ دەکات. دوای گەڕانەوەی دەعواکە بۆ دادگاکەی خۆی و بەرێکردنەوەی دادبینی تیایدا دادگای تێهەڵچوونەوە بە ژمارە ٤٦/س/٢٠٠٠لە ٢٠٠١/٩/٣٠ بەیەکگرتوویی لەگەڵ ٤٤/س/٢٠٠٠ حوکمێکی بە ئامادە بوونی هەردوولا دەرکرد، کە دەکرێت تەمیز بکرێتەوە تیایدا هاتووە: بڕیار/

١-هەڵوەشاندنەوەی حوکمە بەراییەکە کە لە دەعوای ژمارە ٩٣٠/لێنارازی کەسی دیکە/٩٩٩ لەدادگای بەرایی هەولێر لە ٢٠٠٠/٦/١دەرچووە.

٢-پووچەڵ کردنەوەی حوکمە بەراییەکە کە لەدادگای بەرایی هەولێر لە دەعوای بەرایی ژمارە٩٣٠/ب/٩٩٩لە٣٠/١٢/٩٩٩دەرچووەو دەعوای لێنارازی لەسەر کەسی دیکەی یەکەمیش رەت بکرێتەوە (داواکار-ع).

٣-پووچەڵ کردنەوەی قەیدی ژمارە ٤٣/حوزیران/ ٩٩٨ بۆ پارچە زەوی ژمارە ٣٨٤/بازار لەبەرێوەبەرایەتی تۆمارکردنی خانووبەرە لە هەولێر و سەرلە نوێ تۆمارکردنەوەی بەناوی (ر)/ لێنارازی کەسی دیکەو تێهەڵچووەکانیش خەرجییەکان و ماندووبوونی پارێزەریەتیشییان بکەوێتە ئەستۆ بۆ بریکاری تێهەڵچووەوەی یەکەم پارێزەر (ﻫ) بەبڕی (٦٠٠) دینار. لەبەر ئەوەی بریکارانی تێهەڵچووە وە لەسەریان قەناعەتیان بە حوکمی ناوبراو نەهات لەرێی تەمیزەوە تانەیان لێداو داوایان کرد هەڵبوەشێتەوە لەبەر ئەو هۆکارانەی لە عەریزە تەمیزییەکانیاندا هاتووە کە رەسمە تەمیزییەکەیان دراوە ٢١و٢٤/١٠/٢٠٠١. لەبەر یەکگرتوویی هەردوو تانەکە لە حوکمێکدا بڕیاردرا یەکبخرێن و بەیەك شێوە سەیر بکرێن.

**بڕیار/** دوا بەدوای وردکاری و وتوێژ لەلایەن دەستەی گشتی ئەم دادگایەوە، دەرکەوت کە هەردوو تانەکە لە ماوەی یاساییدا پێشکەش کراون لەبەر ئەوە بڕیاردرا لە رووی شێوەوە قبوڵ بکرێت، دوا بەدوای پێداچوونەوەی حکومە تەمیزکراوەکە دەرکەوت کە راستەو لەگەڵ یاسادا دەگونجێت، بەشێوەیەك بەپێی بڕیارە راست کردنەوەکە هاتووە، کە لەدەستەی گشتی ئەم دادگایەوە لە رێکەوتی ٢٠٠٠/٧/٩ بە ژمارە ١٦/دەستەی گشتی/٢٠٠١ دەرچووە، لەبەر ئەوە بڕیاردرا پەسند بکرێت و تانەتەمیزییەکان رەتبکرێنەوەو تەمیزکارانیش رەسمی تەمیزیان بکەوێتە ئەستۆ، بڕیارەکەش بە رێکەوتن لە ٢٠٠١/١٢/٢٤ دەرچوو.

سەرۆك

رەشید عەبدولقادر سەلیم





# بۆ هەر پرسیارێك وەڵامێك

ئێمە دەزانین زۆر کێشەی ئایینی و دەروونی و باوەڕ لە ڕێگــەی پرســیارەوە چارەسەر دەکرێت، پرسیار کلیلی کردنەوەی گرێیە، پەندی کوردییە( پرســابە و دانابە ) و زۆربەی فەرمانەکانی خودا لە ئەنجامی پرسیاری یارانــەوەبووە، دەیان ئایەت هەیە ( پرسیار دەکەن ) خــودا بــۆ خــۆی لــە زمــانی قورئانــەوە وەڵامی دەداتەوە، خۆری ئیسلام لـــە یەکــەم ژمــارەوە ئــاواتی ئــەوەبووە کــە خوێنەرانی پرسیار بکەن و هەر گرێو کێشەیەکیان هــەبێت لــە ڕێگــەی ئــەم گۆشــەوە بۆیــان ڕوون بکرێـــتەوە، هــەندێ ژمـــارە لەبـــەر دووری مـــاوەی بڵاوکردنەوەی گۆڤارەکە ( وەرزییە ) و بۆماوەی سێمانگ کــە چارەکــە ســاڵێکە وەڵامی گەرما و گەرمی پێ نییە، لەبەرئەوە ئەگەر لەم ماوەیەدا پرســـیارمان بۆ هاتبێت پشتگوێ نەخراوە، ئەگەر لــە ژمارەیەکیشــدا نــەبووبێت پرســیار نەبووە.

خۆری ئیسلام

خوشکە هەرێز ئەپرسێ کێشــەی شــیرخواردن ڕەگ و ڕیشــەی لـــە کۆمەڵگــەی ئیسلامی کــوردەواری هەیــەو دایــك و بــاوك شــارەزای پێویستیان لەسەر نییە لە خــۆری ئیسلامدا ئاماژەی پێ نەکراوە؟

لــە وەڵامــی ئــەم خوشــکەو هـــەموو دایـــك و خوشـــکانی موســـڵمانی کوردســـتان دەڵێـین: راســـتە شـــیرخواردن کێشـــەی کۆمەڵگەیـــە، بـــەڵام لـــە فیقـــهی ئیســـلامیدا زۆر بـــە وردی یاســـاو





ڕێساو بنەمای بۆ دانراوە یەك لەو پێناسە زۆر گشتگیرە ئەمەیە:

((شیردەر لە جێگەی دایکە بۆ شیرخۆر)) کەواتە ئەوەی کە لە شێوەی دایکی ڕاستەقینەدایە بۆ دایکی شیری هەیە، بەڵام هەندێ مەسەلەی جیاواز هەیە: یەکەم: بەچەند شیرخواردن، دووەم: لەچ تەمەنێکدا، سێیەم: لەچ کاتێکدا، چوارەم: ئایا مەرجی گەیشتنی شیر یان دەم لە مەمکی دایك، پێنجەم: مەرجە پێکەوە بژین، شەشەم: مەرجە لە گەرووەوە بۆ ناو گەدە، حەوتەم: خاوەن شیر وەك باوك وایە، هەشتەم: شایەتی شیرخواردنی و، نۆیەم: باری شیردەر. بەڵام شیکردنەوەی ئەم باسانە زۆری دەوێ بەکورتی رای جیاوازی زانایان باس دەکەین.

یەکەم: ئەندازەی شیرخواردن دەبێ (پێنج قوم) یان پێنج جار مژین بێت و لەوە کەمتر نییە.

دووەم: شیرخواردن لە تەمەنی یەك ڕۆژە هەتا دوو ساڵی وەرزی، کە شیرخواردنی گەورەو کاریگەری نییە.

سێیەم: ئەگەر لە ماوەی دوو ساڵدا منداڵ لە شیر برایەوە و خواردنی دەخواردو شیری خوارد کاریگەری هەیە.

چوارەم: بەهەر شێوەیەك شیر بگاتە گەدەی منداڵ کاریگەری هەیە.

پێنجەم: خاوەن شیر وەك باوك وایە.

شەشەم: شایەتی شیرخواردن پێویستی بە چوار ئافرەت هەیە.

حەوتەم: دەبێ ئەو ئافرەتە کە شیردەدا بالغ بێت و زیندوو بێت، کەواتە شیری مردوو پیاو هۆی حەرام بوون نییە.

# شمس الاسلام



مجلة ثقافية علمية اسلامية
تصدرها وزارة الاوقاف والشؤون الاسلامية
لاقليم كوردستان العراق

15

السنة الرابعة

ذى الحجة ١٤٢٢ هـ        رەشەمێ ٢٧٠١ ی ك

شباط ٢٠٠٢ م

العنوان
اربيل - ديوان وزارة الاوقاف والشؤون الاسلامية
مديرية الاعلام
☎ ٢٢٣٠٩٤٤
٢٢٢٢٦٩٣

في هذا العدد:







أوّلَ بيْتٍ وُضِعَ لِلنَّاسِ
لَلَّذِي بِبَكَّةَ مُبَارَكًا
وَهُدًى لِلْعَالَمِينَ ﴿٩٦﴾ فِيهِ
آيَاتٌ بَيِّنَاتٌ مَقَامُ
إِبْرَاهِيمَ وَمَنْ دَخَلَهُ
كَانَ آمِنًا وَلِلَّهِ عَلَى
النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ مَنِ
اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا
وَمَنْ كَفَرَ فَإِنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ
عَنِ الْعَالَمِينَ

صدق الله العظيم

( سورة آل عمران/ ٩٦ - ٩٧ )





# الايمان والعلم

**عثمان المفتي**
**المدير العام لديوان الوزارة**

يقول بعض الفلاسفة بأنه لم تكن هناك حاجة للرسل والأنبياء والكتب السماوية. فالعقل هو الرسول، والكون والطبيعة هما كتاب الله.

فبالمخلوق يعرف الخالق. وقد اسهب علماء الاسلام في هذا الاتجاه لكن بالايمان المطلق فاسسوا علم المنطق وعلم الكلام. لقد سقت هذه المقدمة لاقول بان الانسان الذي أودع الله فيه العقل بعد أن جعله خليفته في الارض.هذا الانسان حلق بعقله في أعالي الكون وغاص في نفسه الى اعمق الاعماق... فعن اي شئ تبحث ايها الانسان ؟

عن أي شئ تفلسف الحياة والكون بما تشاء وترمي بالأفكار في بطون الكتب حتى كادت المدن أن تضيق بها فعمَ تبحث؟ مرةً تثبت وجود خالقك... ومرةً أنت متردد! ومرةً أنت تلغيه. تصغر هذه الفكرة وتكبَر تلك وتسحب هذا وترمي ذاك ماذا جرى لعقلك... هل جننت..؟

تخترع اشياءً تشبه فعل الجن...

وترحل الى مجاهيل الفضاء...

تدخل الى أعماق الذرة والخلية...فنفجر الذرة وتتلاعب بالخلية... وتخترع وتكتشف وتطور... حتى لقد دخلت في شفرة الجينات وفككت رموزها... وتباهيت حتى كاد الغرور أن ينال منك... لكن اياك اياك... وأسمع مقالي جيداً وانتبه وأصغ لما اقول وانصت وتأمل وفكر:

ان البشر المفتش في بقاع الارض يشبهون تلاميذ الصف الاول الابتدائي والذي يعلمنا هو الله سبحانه. وقد قدَر منذ الازل أن يكشف لك بعض العلوم فضلا منه وتكريماً وعندما يكتشف البشر أو يخترع شيئاً هنا في الشرق وآخر في الغرب ومثلها في الشمال والجنوب فذلك هو تعليم الله في المنهج المخصص لك. فعندما يحين موعد تعليمك شيئاً جيداً ينزله الله تعالى من علم غيبه الى السماء الدنيا لينهل منه تفكير عالم ما هنا أو هناك... لافرق.

وسيبقى رب العالمين يعلمك... ويعلمك... حتى ينهي سبحانه وتعالى ماقد خصصه لك من علوم لحكمة لايعرفها الا هو سبحانه .

وستترى العلوم عليك حتى آخر صفحة من كتاب منهج العلوم الذي خصصه الله سبحانه وتعالى لك... وعند انتهاء آخر صفحة من ذلك الكتاب يكون قد انتهى تعليمك... وحان موعد القيامة ليمتحنك الله فيما علمك.

وما ارسال الرسل والأنبياء الاّ بميعاد وتسلسل زمني دقيق لاذكاء نور الايمان في قلبك. وبأن كل شئ منه سبحانه.

نعم مع اِنتهاء آخر درس وآخر اِكتشاف وآخر اِختراع سيدق جرس الانتهاء... الاّ وهو النفخ في الصور




ورغم كل ماتعلمته من العلوم التي قدر الله سبحانه وتعالى أن يعلمك رغم كل ذلك. يقول رب العالمين:

﴿وَمَا أُوتِيتُمْ مِنَ الْعِلْمِ إِلاَّ قَلِيلاً/ سورة الاسراء-٨٥﴾ ﴿يَاأَيُّهَا الإِنسَانُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ الْكَرِيمِ سورة الانفطار-٦﴾.

ما نفع تلك العلوم اذا لم تعرف به الله اقرا معي الآية الكريمة: ﴿الَّذِينَ يَذْكُرُونَ اللهَ قِيَامًا وَقُعُودًا وَعَلَى جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَذَا بَاطِلاً سُبْحَانَكَ فَقِنَا عَذَابَ النَّارِ/ سورة ال عمران/١٩١﴾.

لو كنت اعظم استاذ في هذا العالم في الفيزياء. اوفي الطب او في الألكترونات مثلاً فماذا ينفعك علمك بعد موتك وانت ميت حتماً ولهذا قيل: (راس الحكمة مخافة الله).

كل علم لا يقربك من الله سبحانه... فهو عبث

واشرف العلوم واجلها هو العلم الذي يقربنا من الله ويزيد معرفتنا به سبحانه يملأ صدورنا بالايمان. فيا أيها الانسان تأمل نفسك فعقلك مستقر العلوم والمعارف والمدارك... وصدرك مستقر الايمان والاعمال وحب الله ونبيه محمد (صلى الله عليه وسلم). ولهذا فان رب العالمين يخاطبنا في كتابه الكريم في مواضع عدة عن الصدور فيقول عز من قائل: ﴿يَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ إِنَّهُ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ/ سورة هود-٥﴾ ﴿أَوَلَيْسَ اللَّهُ بِأَعْلَمَ بِمَا فِي صُدُورِ الْعَالَمِينَ/ سورة العنكبوت-١٠﴾ ﴿بَلْ هُوَ آيَاتٌ بَيِّنَاتٌ فِي صُدُورِ الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ/ سورة العنكبوت-٤٩﴾

والكثير الكثير من مثل هذه الآيات الكريمة

ويوم القيامة يجمع الله سبحانه وتعالى دفاتر الأعمال لتعرض الأعمال في الميزان فيقول عز من قائل: ﴿أَفَلاَ يَعْلَمُ إِذَا بُعْثِرَ مَا فِي الْقُبُورِ* وَحُصِّلَ مَا فِي الصُّدُورِ/ سورة العاديات-٩-١٠﴾.

سبحان الله عن غفلة الناس... وجهل الكثيرين منهم بما يجري في عالم الغيب... فالعلوم التي في العقول لاتنفع أصحابها الا بمقدار ماقد تم تحويلها الى فعل ايماني في مخزن الصدور.

وليس كلامي هذا تسفيهاً للعلوم الأخرى ولكن العلم بدون تقوى واخلاق يعد من عمل الشيطان.

ولله در الامام الشافعي اذ يقول:

لوكان للعلم من دون التقى شرف

لكان أشرف خلق الله ابليس

ايها الانسان:

لقد اعتنيت بالعقل على حساب القلب او الصدر...واهتممت بالعلوم على حساب الدين والأخلاق الفاضلة والقيم الرفيعة فاذا تجردت من القلب اصبحت آلةً صماء.

واذا تجردت من العقل اصبحت كالبهائم ليس لها هدى ولا دليل اذن فان لك جناحان تطير بهما... العقل والايمان.

ودائماً وابداً العقل في خدمة الايمان تكتسب بالعقل وتودعه في خزينة الايمان: ﴿لِيَزْدَادُوا إِيمَانًا مَعَ إِيمَانِهِمْ/ سورة الفتح-٤﴾ فهل تفعل؟

﴿رَبَّنَا لاَ تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا وَهَبْ لَنَا مِنْ لَدُنْكَ رَحْمَةً إِنَّكَ أَنْتَ الْوَهَّابُ﴾.







مسألة فقهية

# (بيع الوفاء)
# (وفي اصطلاح بعض مناطق كوردستان يعرف ببيع "مەرونه")

ملا محمد ملا احمد ئاكرەیی

## التعريف:

١-البيع هو مبادلة مال بمال. والوفاء لغة ضد الغدر. وفي بعهده واوفى بمعنى واحد. والوفاء الخلق الشريف العالي الرفيع واوفى الرجل حقه وفاه اياه بمعنى اكمله له واعطاه وافياً.

وفي اصطلاح الفقهاء بيع الوفاء هو بيع بشرط ان البائع متى رد الثمن برد المشتري المبيع اليه. وانما سمى بيع الوفاء لان المشتري يلزمه الوفاء بالشرط. هذا ويسميه المالكية بيع(الثنيا) والشافعية بيع العهدة والحنابلة بيع الامانة ويسمى ايضاً بيع الطاعة وبيع الجائز وسمى في بعض الكتب الحنفية بيع المعاملة.

## حكم بيع الوفاء:

٢-اختلف الفقهاء في الحكم الشرعي لبيع الوفاء. فذهب المالكية والحنابلة والمتقدمون في الحنفية والشافعية الى ن بيع الوفاء فاسد لان اشتراط البائع اخذ المبيع اذا رد الثمن الى المشتري يخالف مقتضى البيع وحكمه وهو ملك المشتري للمبيع على سبيل الاستقرار والدوام وفي هذا الشرط منفعة للبائع ولم يرد دليل معين بدل على جوازه فيكون شرطاً فاسداً يفسد البيع باشتراطه فيه.

ولان البيع على هذا الوجه لايقصد منه حقيقة البيع بشرط الوفاء وانما يقصد من ورائه الوصول الى الربا المحرم وهو اعطاء المال الى اجل ومنفعة البيع هي الربح والربا باطل في جميع حالاته.

وذهب بعض المتأخرين من الحنفية والشافعية الى ان بيع الوفاء جائز مفيد لبعض احكامه وهو انتفاع المشتري بالمبيع دون بعضها وهو بيع من اخر. وحجتهم في ذلك ان البيع بهذا الشرط تعارفه الناس وتعاملوا به لحاجتهم اليه فراراً من الربا فيكون صحيحاً لايفسد البيع باشتراطه فيه وان كان مخالفاً للقواعد تترك بالتعامل كما في الاستصناع.

٣-وذهب ابو شجاع وعلي السغدي والقاضي ابو الحسن الماتريدي من الحنفية الى ان البيع الوفاء رهن وليس بيع فيثبت له جميع احكام الرهن فلا يملكه المشتري ولا ينتفع به. ولو استأجره المشتري لم تلزمه اجرته كالراهن اذا استأجر





المرهون من المرتهن ويسقط لدين بهلاكه ولايضمن مازاد عليه واذا مات الراهن كان المرتهن أحق به من سائر الغرماء.

وحجتهم في ذلك ان العبرة في العقود للمعاني لا للألفاظ والمباني ولهذا كانت الهبة بشرط العوض بيعاً. وكانت الكفالة بشرط براءة الأصيل حوالة وامثال ذلك كثير في الفقه. وهذا البيع لما شرط فيه اخذ المبيع عند رد الثمن كان رهناً لأنه هو الذى يؤخذ عند اداء الدين.

١. قال ابن عابدين: في بيع الوفاء قولان.

الاول/ انه بيع صحيح مفيد لبعض أحكامه من حل الانتفاع به الا انه لايملك المشتري بيعه قال الزيلعي في الاكراه وعليه الفتوى.

الثاني/ القول الجامع لبعض المحققين انه فاسد في حق بعض الأحكام حتى ملك كل منها الفسخ. صحيح في الأحكام كحل الانزال ومنافع المبيع ورهن في حق البيع حتى لم يملك المشتري بيعه من اخر ولارهنه وسقط الدين بهلاكه فهو مركب في العقود الثلاثه. كالزرافة فيها صفة البعير والبقرة والنمر. جوز لحاجة الناس اليه بشرط سلامة البدلين لصاحبها قال في البحر: وينبغي ان لايعدل في الاقتاء عن القول الجامع. (وفي النهر) والعمل في ديارنا على ماء رجحه الزيلعي./ابن عابدين ٢٤٦/٤/٢٤٧ط.

وقال صاحب بغية المسترشدين من متأخري الشافعية بيع العهدة صحيح جائز وثبتت به الحجة شرعاً وعرفاً على قول القائلين به. ولم ار من صرح من القائلين بكراهته وقد جرى عليه العمل في غالب جهات المسلمين من زمن القديم وحكمت بمقتضاه الحكام واقره من يقول به من علماء الاسلام مع انه ليس من مذهب الشافعي. وانما اختاره من اختاره ولفقه من مذاهب للضرورة الماسة اليه. ومع ذلك فالاختلاف في صحته من اصله وفي التفريع عليه لايخفى على من له المام بالفقه- بغيه المسترشدين ص١٣٣.

## شرط بيع الوفاء عند من يجيزه:

١. لتطبيق احكام بيع الوفاء شرطان عند من يجيزه لابد من توافرهما.

أ. ان ينص في العقد على انه متى رد البائع الثمن رد المشتري المبيع.

ب. سلامة البدلين. فان تلف المبيع وفاء وكانت قيمته مساوية للدين (أي الثمن) سقط الدين في مقابلته وان كانت زائدة على مقدار الدين وهلك المبيع في يد المشتري سقط من قيمته قدر ما يقابل الدين وهو في هذا كالرهن عند الحنفية- ابن عابدين٢٤٧/٤ مجلة الاحكام مادة ٣٩٩/٤٠٠.

## ألاثار المترتبة على بيع الوفاء

هناك اثار تترتب على بيع الوفاء عند من يجيزه من متاخري الحنفية وغيرهم مجملها فيما يلي:

### اولا: عدم نقل الملكية

ان بيع الوفا و لا يسوغ للمشترى التصرف الناقل للملك كالبيع والهبه عند من يجيزه ويترتب على ذلك عده مسائل:

أ. عدم نفاذ بيع المبيع وفاءً من غير البائع وذلك لانه كالرهن والرهن لايجوز بيعه.

ب. لايحق للمشتري في بيع الوفاء الشفعة وتبقى الشفعة للبائع.

ج. الخراج في الارض المبيعة بيع وفاء على البائع.

د. لو هلك المبع في يد المشتري فلا شئ لواحد منها على الاخر.

هـ. منافع المبيع بيع الوفاء للبائع كالاجارة وثمرة الاشجار ونحوها فلو باع داره من اخر بثمن معلوم بيع وفاء وتقابضا ثم استأجرها من المشتري مع شرائط صحة الايجارة وقبضها ومضت المدة هل يلزمه الاجر قال لا. فتبين ان الملك لم ينتقل للمشتري اذ لو انتقل لوجبت اللاجرة وكذلك ثمر




الشـــجر للبائـع دون المشـتري فـأن المشـتري لـو اخذ مـن ثمـــر الاشـــجار شـــيئاً فـأن اخـذه بـأذن البـائع بـرات ذمتـه وان اخـذه بغـير اذنـه ورضـاه ضمنها.

و. انتقال المبيع وفاءً بالارث الى ورثة البائع فلو باع رجل مـن اخـر بيـع الوفـاء وتقابضـا ثـم باعـه المشتري من اخر بيعاً باتاً وسلم وغاب فللبائع او ورثته ان يخاصموا المشتري الثاني ويستردا منـه البستان.

وكـــذا اذا مـــات البـائع والمشـتريان ولكـل ورثـــة، فلورثـة المـالك ان يسـتخلصوه مـن ايـدي ورثـــة المشتري الثاني ولورثة المشتري الثـاني ان يرجعـوا بمـا ادى مـن الثمـن الى بائعـه في تركتـه الـتي في ايـدي ورثتـه. ولورثـة المشـتري الاول ان يسـتردوه ويحبسـوه بديـن مورثـهم الى ان يقضـوا الدين.

## ثانياً: حق البائع في استرداد المبيع

يحـق للبـائع ان يسـترد مبيعـه اذا دفـع الثمـن للمشتري في حالتي التوقيت وعدمه.

## ثالثاً: اثر موت احد العاقدين في البيع الوفاء:

سبق قريباً انه اذا مات المشتري او البائع بيـع الوفـاء فـان ورثتـه يقومـون مقامـه نظـراً لجـانب الرهن.

## رابعاً: اختلاف المتعاقدين في البيع الوفاء:

من اهم الاحكام التي تتعلق باختلاف المتعاقدين في بيع الوفاء مايلي:

أ. اذا اختلف المتعاقدان في اصل بيع الوفاء. كأن قال احدهما كان البيع باتاً او وفاءً فالقول لمدعي الجد والبتات الا بقرينة الوفاء وهناك قول اخر عند الحنفية ان القول لمدعي الوفاء استحساناً.

ب. اذا قام كل من المشتري والبائع البينة تقدم البينة الوفاء لانها خلاف الظاهر.

ج. اذا لم يكن لاحدهما البينة فالقول قول مدعي البتـات قـال ابـن عـابدين فيحصـل الاستحسـان في الاختـلاف في البينـة ترجيـح قـول المدعـي البتـات. ومن القرائن الدالة على الوفاء نقصان الثمن كثيراً وهـو مـا لايتغـابن فيـه النـاس عـادة الا ان يذعـى صاحبه تغير السعر. والله اعلم.

المصادر:


١. بغية المسترشدين.
٢. مجلة الاحكام العدلة.
٣. كشاف القناع.
٤. الفتاوى الهندية.
٥. تبين الحقائق للزيلعي.
٦. البحر الرائق.
٧. ابن العابدين.
٨. مغني المحتاج.
٩. نهاية المحتاج.
١٠. تحفة المحتاج.
١١. البزازية بهامش الهندية.
١٢. معين الاحكام.
١٣. حاشية الطحاوي على الدر المختار.




# الصحافة الاسلامية
# بين عز الكورد واللغة العربية

**مدير التحرير**

من المعلوم أن اللغة العربية لم تغب من التاريخ الكوردي يوماً بعد بزوغ فجر الاسلام بل كانت حاضرةً، في كل زمن وصعيد وميدان وكانت شاهدة للاحداث والابداع الكوردي منذ قامت الرواسي الشوامخ في كوردستان تعانق آيات القرآن الكريم وتحت كل شجرة وعلى كل نبع وتحت كل صخرة في جباله الشماء قصة حضارة اسلامية في زيها الكوردي اوذكرى بطولة او أثر في العلم والدين اونابغة في علوم الآلة والغاية وفي التاريخ الف شاخص وشاهد.

ولست هنا في استعراض صفحات مجد الكورد في هذا المضمار ويكفي زهواً وفخراً أن نشير الى مجد الكورد بعد بزوغ نور الاسلام واشراق حضارة الاسلام على كوردستان، أن الكورد تلقى اللغة العربية كما يتلقى الظمآن ماءً فراتاً يطفئ ظمأه ووجد الراحة والهدوء حين تخلى عن ديانة الحكام المتسلطين عليه رغم ارادته فكان الاسلام والقرآن هداية للقلوب وضوءً ساطعاً للعقول وعزاً وسلاماً لأرض كوردستان – العراق وتحريراً لانسانه من العبودية للعباد الى عبادة الله.

وبعد الانتفاضة المباركة في ربيع ١٩٩١م بدء الكورد مسيرة صاعدة بالأسلام وبدات باللغة الكوردية تستكمل عناصر قوتها وديمومتها ببليغ مفرداتها وقوة بلاغة اساليبها واصبحت الثوب الأكثر تالقاً للاسلام وأصبح لسان الكورد آداة التعبير في الحقول العلمية والثقافية والحضارية. وفي ظل تجربة كوردستان يعمل المخلصون من الكورد من أجل توسيع آفاق التعارف بين اللغة العربية لغة القرآن واللغة الكوردية لغة الأم وعدم انفصام الامة الكوردية والأمة العربية بسبب اختلاف اللسان ونناضل في مجلة شمس الاسلام في كوردستان بقلوب صافية ونيات صادقة واقلام واعية من أجل تعايش الصداقة والتعارف بين اللغة القومية ولغة الاسلام رغم ان–البعض–بات أهواءهم متعلقة بامجاد زائلة زائفة وأمست قلوبهم مليئة–لا بالغبطة– بل بالحسد ويمارسون أنواعاً من المكر والخداع لتعريب افكارنا وعقولنا مثل تعريب ارضنا ولساننا ويتفننون في سقط القول وبدع المبادئ وتحريف الفهم الكوردي لثقافة اللغة العربية واحدثوا ثغرات وفجوات في التعايش والتسامح والبناء الحضاري والعقيدة والفكر الاسلامي عبر التاريخ المشرق بين الأمم الاسلامية على أختلاف الالسن والأوطان.

كل ذلك لثقة شعبنا المطلق بالتجربة الرائدة وتحصين البيت الكوردي وتحقيق أماني الكورد داخل الكوردستان المحررة وتجاوز صعاب تفعيلات الاضطهاد الى البناء السياسي والاقتصادي والعلمي وايمان الفصائل القائدة في كوردستان بمنهج فكري ملتزم بالاسلام والقومية ضد العنصرية والاضطهاد القومي ونحن بانتظار البحوث والأفكار التي تخدم مسيرة شعبنا في حكم نفسه بنفسه والجمع بين جناحيي الحكم الأصيل الاسلام والقومية وشكراً لاصحاب الأقلام الشريفة سلفاً.